**چاوەڕوانی بەرگی سێیەمی ( ژیانی صدام ) بن بەناوبیشانی :**

# ( داوای لێبوردن لە صدام ئەکەم )

---

**ئەم نوسراوەم پێشکەشە بە :**

**هەموو ئینسانێکی حەق ویست ...**

**زۆر سوپاس بۆ:**

**بەڕێز کاك ( کاوە پێنجوێنی )کە بەچاپی دووەم دا چۆتەوەو ئەرکی زۆری کێشاوە .**

---

- ✓ ژیانی صدام
- ✓ بەرگی یەکەم و دووەم
- ✓ سۆران عومەر
- ✓ چاپی دووەم - ٢٠٠٥
- ✓ تیراژ ٢٠٠٠
- ✓ 
- ✓ ئیمەیل : soranomar2000@yahoo.co.uk
- ✓ ژمارەی سپاردن : (٢٣٩) ی ساڵی (٢٠٠٣)ی وەزارەتی ڕۆشنبیری

---

# ناوەڕۆك

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی

زۆر دەمێکە چاوەڕێ بوین تۆڵەی ئەو هەموو زوڵم و زیندان و زەبرو زەنگ و وێرانکاریەی صدام بەچاوی خۆمان ببینین ، بەلاّم سوپاس بۆ خوا زۆری نەخایاند ئەو صدامەی کە خەڵك نەیدەوێرا لە دوری هەزاران میل لە حوکمی ڕەشیەوە ناوی بەخراپ بهێنێت لە تەنهایش دا ، بەلاّم بینیمان چۆن بویە بەدەعبایەکی سەرسوڕهێنەر و سەرەنجام بوو بەو سەرکردە دیکتاتۆرە دۆڕاوو بێ دەسەلاّتەی کەلە کونە ڕێوییەك دا دەستگیر بکرێت و هەر لە و ولاّتەدا دادگایی بکرێت کە ٣٥ساڵ زوڵمی تێدا کردووە .

هەرچەندە دەبوو ئەم نوسینەم زوو بلاّو بکرێتەوە بەلاّم جەخار ئەو ساتەی کە صدام نەئەما و زیندان والاّ کرابوو من نەمدەزانی صدام و عێراق چییان لێ بەسەر هاتووە ، چونکە خۆم کەوتبومە زیندان بەهۆی بارودخی ڕامیاری ئەوکاتەوە ! بەلاّم توانیم ئاواتەکەم بهێنمەدی و دوای ئازاد بوونم بەرگی یەکەمی کتێبەکەم بلاّو کردەوە ، هەر لەساتی لەچاپدانی بەرگی یەکەم دا بوو دوو کوڕە جەلادەکەی صدام بەسزای خۆیان گەیشتن و کوژران دوای بلاّو بونەوەشی خودی صدام دەستگیر کرا ئێستەش کە وا بەرگی دووەم چاپ دەبێت لەدوای یەکەمین دانیشتنی دادگایی صدامەو دەزانم کتێبەکەم بلاّو دەبێتەوە بەبێ ئەوەی ئەنجامی دادگایی کردنەکەی تێدا تۆمار کرابێت ، بەو هیوایەی دادگای عێراقی لەوئاستەدا بێت تەواوی ناعەدالەتیەکانی صدام عادیلانە بەسزای خۆی بگەیەنێت . وا چاپی دووەمی کتێبەکەم دەکرێتەوەو صدام هەر بەسەلامەتی لە ئەمینترین شوێنی ئەم ولاّتەدا پارێزراوە !!

سۆران عومەر

٢٠٠٤/٧/٥ - ٢٠٠٥/٤/٥

# دەسەڵاتدارانی عێراق

باس لەو حاکم و سەرۆکانە دەکات کە لە کۆتایی سەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیەوە لە عێراق دا جڵەوی دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست تا دەگاتە صدام :

## یەکەم : جەنەراڵ مۆد ( ١٩١٧/٣/١١ - ١٩١٧/١١/١٨ )

جەنەراڵ (ستانلی مۆد) سەرۆکی هێزی بەریتانیا بوو کە توانییان لە (١١ ی ئازاری ١٩١٧) شاری بغداد بگرن و داگیری بکەن ، پاش شکاندنی گەمارۆی سوپاکەیان لە ناوچەی کوت .

مۆد لەگەڵ تورکەکان شەڕێکی سەختی کرد تا توانی بگاتە بغداد و تەواوی شارەکانی تری عێراق داگیر بکات و کۆتایی بەحوکمی عوسمانیەکان بهێنێت لە عێراق دا ، لە ( ١٩/ئازار) دا بەیانێکی بڵاو کردەوە کە تیایدا هاتووە (جئنا محررین لا فاتحین ....) پاش ئەمە کێشەو ناکۆکی کەوتە نێوان (جەنەراڵ مۆد) و (سیر برسی کوکس) چونکە (مۆد) شێتی دەسەڵاتدارێتی بوو ، ناکۆکی نێوانیان بەردەوام بوو لە (١١/١٤/ ١٩١٧) جەنەراڵ ( مۆد) بەشداری ئاهەنگێکی قوتابخانەی (الأليانس) ی (یەهودی) کرد ، لەوئاهەنگەدا هەندێ (شیر)ی خوارد ، پاش چەند سەعاتێك هەستی بەئازار کردو توشی نەخۆشی کۆلێرای کرد ، دوای چوار ڕۆژ لەنەخۆشخانە چارەسەری نەبوو

نەخۆشییەکە کوشتی و تەرمەکەی لە گۆڕستانی ئینگلیزەکان نزیکی (باب المعظّم) نێژرا .

## دووەم : ئارنۆلد ولسن ( ١٩١٨-١٩٢٠ )

(ولسن) حاکمی سیاسی گشتی عێراق بوو ، لەتەمەنی (٣٤) ساڵیدا گەیشتووە بە پلەی (ظابط) ، بەلاّم کێشەی گەورەی ئەوەبوو سایکۆلۆجیەتی کۆمەڵگەی عێراق شارەزانەبوو وەك (سیر برسی کوکس) . (ولسن) ساڵی (١٩٠٣) کۆلیجی سەربازی لە بەریتانیا تەواو کردووە ، وەك کارمەندێکی سیاسی لەولاّتی (هیند) دەستبەکاربووە ، بەریتانیا لە عێراق دا سیاسەتی بەجۆرێك بووە کە باوەڕی بەوە نەبووە گەلانی عێراق بتوانن حوکمی خۆیان بکەن بۆیە حوکمی عێراق لەو سەردەمەدا بوو بە حوکمی ڕاستەوخۆی ئینگلیز ، بەلاّم سیاسەتی درۆ لەگەڵ گەلانی عێراق و داگیرکاری بەجۆرێکی لیّ هات گەیشت بەئینتیدابی بەریتانیا بۆیە شۆڕش دژبە ئینگلیز دەستی پێکرد بەتایبەت شۆڕشی ساڵی (١٩٢٠) ناچار بەریتانیا گەڕایەوە سەر سیاسەتی (سیر برسی کوکس).

## سێیەم : سیر برسی کوکس ( ١٩٢٠/١٠/١ )

مەندوبی سامی حکومەتی بەریتانیابوو لە عێراق دا ، کەسێکی هێدی و لەسەرخۆ بوو پێچەوانەی ئەو کەسایەتیانەی پێشتر بوو ، ( سیر برسی ) سیاسەتی داگیر کاری ئینگلیزی بەم شێوەیە پیادە کرد (المخادع وسیاستە الثعلبیة الماکرة) ، یەکەمین جار لەگەڵ جەنەراڵ مۆد

هێنرایه عێراق ساڵی (١٩١٧) وەك حاكمی مەدەنی عێراق بەڵام نێردرایە ئێران و لەتاران كرا بە (الوزير المفوض البريطاني) ساڵی (١٩٢٠) گەڕایەوە عێراق ، بۆ هێوركردنەوەی بارودۆخی ئاڵۆزی سەرهەڵدانی شۆڕش و دروست كردنی حكومەتێكی كاتی بەسەرۆكایەتی (عبدالرحمن النقيب) لە (١٩٢١/٧/١١) بەپێی بڕیارێكی ئەنجومەنی وەزیران ( مەليك فەيصەل ) كرا بەيەكەم مەليكی عێراق .

## چوارەم : عبد الرحمن النقيب ( ١٩٢٠-١٩٢١ )

ناوی (عبد الرحمن المحض الكيلاني نقيب) ە ، سەرۆكايەتی ئەو حكومەتە كاتيەی كرد كە ئينگليز دروستی كرد لە (١٩٢٠/١٠/٢٧) تا ئەو ساتەی لە (١٩٢١/٨/٢٣) مەليك فەيسەڵ كرا بە (شا) ی عێراق ، كتێبێكی بڵاو كراوەی هەيە بريتيە لە :الفتح المبين في توجه جده الشيخ عبد القادر وأولاده وطريقته والرد على مخالفيه .

ساڵی (١٩٢٦) كۆچی دوايی كردووەو لە ژورەكەی (گەيلانی)دا نێژراوە لە بغداد .

## پێنجەم : مەليك فەيصەلی يەكەم ( ١٩٢١-١٩٣٣ )

ناوی (فيصل بن الحسين بن علي الحسني الهاشمي) يە لەنەوەی (الحسن المثنى ابن الحسن المجتبى ابن الامام علي بن ابي طالب عليه السلام (ابو غازي)ی مەليكی عێراقە لە (طائف) لەدايك بووە ، لەگەڵ باوكی ساڵی (١٩٠١) دورخراونەتەوە بۆ (الأستانه) ساڵی (١٩٠٩) گەڕاونەتەوە لەنێوان حيجازو ئەستانەدا لەهاتوچۆدا بوون ، دواتر

سەردانی سوریای کردووە لەساڵی (١٩١٦) دا ، بووە بە سەرۆکی گشتی سوپای عەرەبی شەڕکار لە فەلەستین ، پاشان سەردانی پاریسی کردووە ، لە ساڵی (١٩٢٠) گەڕایەوە سوریا تا لە (١٩٢٠/٧/٢٤) دا فەڕەنسا سوریای داگیر کرد و فەیصەل دور خرایەوە بۆ ئەوروپا ، ماوەیەك لە (ئیتاڵیا) بوو دواتر چووە (ئینگلتەرا) ، دوای سازدانی شۆڕش بەریتانیا لە (قاهیرە) ساڵی (١٩٢٠) کۆنگرەیەکی بەست بەسەرۆکایەتی (ونستون چەرچل) لەو کۆنگرەیەدا فەیصەل هەڵبژێردرا بە مەلیکی عێراق و گەڕێنرایەوە بەغداد .

لە (١٩٣٣/٩/٨) بە سەکتەی دڵ لە پایتەختی (سویسرا) مردوەو تەرمەکەی هێنراوەتەوە بۆ بەغداد ، دوای خۆشی مەلیك غازی کوڕی دانا ، چەند کتێبێکی نوسیوە لەوانە :

- مذكرات فيصل عن القضية السورية .
- فيصل بن الحسين في خطبه وأقواله .

## شەشەم : مەلیك غازی (١٩٣٣-١٩٣٩)

ناوی (غازی کوڕی فیصل کوڕی حسین کوڕی علی حسنی هاشمی) یە ، ساڵی (١٩١٢) لە مەکە لەدایك بووە ، ساڵی (١٩٢٤) هاتۆتە بغدادو ناوی (ولی عەهدی میرنشینی عێراق)ی وەرگرتووە ، باوکی ناردیە خوێندن ساڵی (١٩٢٧)لە کۆلیجی (هاروی ئینگلتەرا) و ماوەی دووساڵ و دواتر گەڕایەوە عێراق بۆ کولیەی سەربازی ، لەکاروباری دەوڵەت دا جێگری باوکی دەکرد، ساڵی (١٩٣٣) دوای باوکی دەسەڵاتداری عێراق کەوتە دەست و ئەمیش لە (١٩٣٩/٤/٤) گیانی لەدەست دا کاتێك

بەسەیارەوە خۆی کێشا بە عەمودێکی ( تەلگراف)داو سوتا لەناویدا ، هەرچەندە لەبارەی مردنیەوە زۆر شتی تریش دەگێڕنەوە ، لەسەردەمی مەلیك غازی دا چەندین شۆڕش و ئینقلابی سەربازی سەری هەڵدا بەتایبەت (شۆڕشی فورات و کودەتای بەکرصدقی لە ١٩٣٦/١٠/٢٩)، لە پێش مردنی دا باوکی وەسێتی بۆ کرد کە جڵەوی حوکمی بۆ بەجێ دێڵێت دوای خۆی چونکە ئەو کاتە تەمەنی یاسایی تەواو نەکردبوو بۆ مەلیکی .

## حەوتەم : مەلیك فەیصەلی دووەم ( ١٩٣٩- ١٩٥٨ )

ناوی تەواوی (فەیصەلی دووەم کوڕی غازی کوڕی فەیصەلی یەکەم کوڕی حسین مەلیکی حجاز کوڕی الشریف محمد کوڕی عبدالمعین کوڕی عون کوڕی محسن کوڕی عبد الله کوڕی حسین کوڕی عبد الله "ئەمیری مەککە" وفیصل لەنەوەی حسن مثنیی کوڕی ئیمام حسنی مجتەبی کوڕی ئیمام علی کوڕی ئەبی تالب) ە .

ساڵی (١٩٣٥) لە شاری بغداد لەدایك بووە، (١٩٣٩/٤/٦) بووە بەمەلیکی عێراق دوای مردنی مەلیك غازی باوکی . ساڵی (١٩٤٧) چۆتە (ئینگلتەرا) ولە خوێندنگەی (ساندویس) خوێندویەتی و دواتر چۆتە کۆلیجی ( هارو) تا (٧/مایس/١٩٤٩)ولە (١٩٥٢/١٠/٢٣) زانکۆی تەواوکردووەو گەڕاوەتەوە عێراق .

## هەشتەم : عبدالإله بن علي ( ١٩٣٩- ١٩٤١ )

ناوی (ئەمیر عبدالإلە کوڕی مەلیك عەلی کوڕی مەلیك حسین)ە ، ساڵی (١٩١٣) لە (طائف)ی خاکی حیجاز لەدایك بووە ، لە زانکۆی (ڤیکتۆریای ئەسکەندەریەی میصر) خوێندویەتی ، دوای ئەوە گەڕاوەتەوە عێراق و پەیوەندی کردووە بەوەزارەتی دەرەوە .

## نۆیەم - الشریف شرف ١٩٤١/٦/٣١ م

لەشاری تایف ساڵی (١٨٨٠) م لەدایك بووە ، لە ناو بنەماڵەی هاشمیەکان دا کە حوکمی حیجازیان کردووە . باوکی ئەمیری شاری (تایف) بووە لەدوای باوکی ئەمارەتی تایفی گرتۆتە دەست ، وەبەشدار بووە لەو جەنگەدا کەمەلیك حسین سەرکردایەتی کردووە دژ بە عوسمانیەکان بەناوی (شۆڕشی گەورەی عەرەب) .
دوای ئەوەی سعودیەکان حوکمی حیجازیان گرتە دەست ، هاتنە عێراق و جێی متمانەی مەلیك فەیصەلی یەکەم بوو ، دوای تێکچونی بارودۆخ لە عێراق دا ساڵی (١٩٤١) پاش ئەمیر (عبدالالە) لە (١٠)ی نیسان دا و دوای شکستی شۆڕشی ئەوساڵە کرابە حاکمی عێراق ، ئەنجومەنی عورفی سەربازی حوکمی زیندانی بۆ ماوەی سێ ساڵ دا بەسەریدا و ساڵی (١٩٨١) کۆچی دوایی کردووە .

## دەهەم - محمد نجيب الربيعي ١٩٥٨ – ١٩٦٣ م

لەشاری بغداد ساڵی( ١٩٠٤ ) لەدایك بووە خێزانەكەیان دەچێتەوە سەر قەبیلەی (ربيعه) دوای خوێندنی دواناوەندی پەیوەندی كردووە بە كۆلیجی سەربازی ساڵی (١٩٢٧) پاشتر چۆتە ( كۆلیجی ئەركانی عێراقی ) تا گەیشتووە بەپلەی (فريق ركن) لە (١٩٥٧/١١/٢) سەفیری عێراق بووە لە (جدە) ساڵی (١٩٥٨)هەڵبژێردراوە بۆ سەرۆكی ئەنجومەنی سەرۆكایەتی لە عێراق دا لەحوكم دا مایەوە تا هاتنی عبدالكریم قاسم .

## یانزەهەم - عبدالكريم قاسم ١٩٥٨-١٩٦٣

ساڵی (١٩١٤) لەشاری بغداد لەدایك بووە لەخێزانێكی عێراقی ، لەگەڵ باوكی لە شاری (صوێره) ژیاوەو دواتر گەڕاونەتەوە بغداد ساڵی (١٩٢٦) مامۆستا بووە لە قوتابخانەی (شامیەی سەرەتایی) لەپارێزگای (قادسیە) ساڵی (١٩٣٢) پەیوەندی كردووە بەكۆلیجی سەربازییەوە ساڵی (١٩٣٤) لەكۆلیج دەرچووەو ساڵی (١٩٤١) چۆتە كۆلیجی ئەركان ساڵی (١٩٥٥) گەیشتووە بەپلەی (عمید روكن) لەساڵی (١٩٦٣) دا بەفیشەك كوژرا .

## دوانزەهەم – عبدالسلام محمد عارف ١٩٦٣- ١٩٦٦

لە (٢١-٣-١٩٢١) دا لە بغداد لەدایك بووە ساڵی (١٩٣٤) خوێندنی سەرەتایی و دواناوەندی تەواو کردووە ساڵی (١٩٤١) کۆلیجی سەربازی تەواو کردووە بەپلەی (ملازم ثاني) بەشداری کردووە لە شۆڕشی ساڵی (١٩٤١) داو دورخراوەتەوە بۆ ( بەصرە ) تاساڵی (١٩٤٤) لەوێ ماوەتەوە پاشتر نقلْ کراوە بۆ (ناصریە) . ساڵی (١٩٤٦) کراوە بەڕاهێنەر لە کۆلیجی سەربازی وگوازراوەتەوە بۆ کەرکوك . چۆتە فەلەستین و بەشداری شەڕی ساڵی (١٩٤٨)ی کردووە تاساڵی (١٩٥٦) یش لە بەشی سەربازی بەریتانیا ماوەتەوە لە (دسلدۆرف ئەڵمانیا) .

کراوە بەسەفیری عێراق لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا ، لە ئینقیلابی (١٤)ی تەمووزی (١٩٦٣)دا کرا بە سەرەك کۆمار ، کە یەکەم سەرەك کۆمارە لە عێراق دا .

حوکمی لەسێدارەدانی بڕیاردراو بەڵام بۆی کرا بە زیندانی بەتۆمەتی ئەوەی ویستویەتی ئینقلاب بکات لە قاسم .

لە ١٤/٤/١٩٦٦ دا لە سەفەرێکی دا لەنێوان (قوڕنەو بەصرە) دا فڕۆکەکەی ئاگری تێچوو سوتا .

## سیانزەهەم - عبدالرحمن عارف ١٩٦٦-١٩٦٨

لەشاری بغداد ساڵی (١٩١٦) لەدایك بووە ، پاشان چۆتە کۆلیجی سەربازی لە (١٩٣٦) بەپلەی (ملازم پانی) کۆلیجی تەواو کردووە ، پاشان گەیشتووە بە پلەی (لیوا) ساڵی (١٩٦٢) خانەنشین کراوە .

بەشداری شۆڕشی (مایسس ١٩٤١) و شەڕی فەلەستینی کردووە ساڵی (١٩٤٨) ، سەرۆکایەتی وەفدێکی سەربازی کردووە بۆ یەکێتی سۆڤێتی جاران بەلاّم سەردانەکەی بڕیووەو گەڕاوەتەوە بۆ بەشداری کردن لە ناشتنی تەرمی براکەیدا (عبدالسلام عارف) .

لە (١٦/٤/١٩٦٦) دا کرا بە سەرۆك کۆماری عێراق بەلاّم لە تەموزی (١٩٦٨) دا بەکودەتای بەعسیەکان کۆتایی بەدەسەلاّتی هێنراو نێردرایە دەرەوەی عێراق .

## چواردەهەم - احمد حسن بەکر ١٩٦٨-١٩٧٩

ساڵی (١٩١٤) لەدایك بووە لەشاری تکریت ، دەرچوی (پەیمانگەی مامۆستایانی سەرەتایی )یە ، ساڵی (١٩٣٨) پەیوەندی کردووە بە کۆلیجی سەربازییەوە لە حکومەتی ( عبدالکریم قاسم)دا ئەندامی ئەنجومەنی عورف سەربازی بووە لە ٢٠/١٠/١٩٥٨ دا گیراوەو دواجار خانەنشین کراوە ، لە ١٩/٤/١٩٥٩ دا دوای ئینقیلابی (١٤ ی ڕەمەزان ١٩٦٣) کراوە بە سەرۆك وەزیران ، لە ئینقیلابی (١٧/ی تەموزی ١٩٦٨) دا بە هێزی چەك عبدالرحمن عارفیان داگرت و ناردیانە دەرەوەی عێراق و دەسەلاّت کەوتە دەستی خۆی . ساڵی (١٩٧٩) بەزۆری صدام وازی لەدەسەلاّت هێناو ڕایگەیاند بەهۆی بارودۆخی تەندروستیەوە ناتوانێت ولاّت بەڕێوەبەرێت و (صدام) بوبە سەرۆك کۆمار

(صدام) سەر بەعەشرەتی (بیگات)ە کەلەناوچەی تکریت نیشتەجێ بون، ئەم عەشیرەتە بە لەوەڕاندنی مەڕو مالاتەوە خەریك و ناسراو بون ، دەسەلاتێکی فراوانیان لەعێراق دا هەبووە خەریکی فرۆشتنی مەڕ بون بەتایبەتی لەبغداد، کاتێك ئینگلیز هاتۆتە عێراق بەڵێنیان داوە بە مەلیك (فیصل) بۆ پاراستنی عێراق . بەڵام مەلیك فەیسەڵ بڕوای پێیان نەدە کرد، تادواجار پەڕەیەکی نوێ لەنێوانیان دا هەڵدرایەوە، (جاك دمبسی) لەکتێبەکەیدا (الصقور) باس لەوە دەکات کە ئەو عەشیرەتانەی لەدەوروبەری تکریت دەژیان لەئەسلا عەرەب نەبوون بەڵکو لەناوچەکانی تورکیاوە هاتون ، زۆریان مەسیحین یان یەهوودی ، هۆی کۆچ کردنەکەشیان ئەو شەڕو ناکۆکیانەی نێوان خۆیان بوو کەلەسەر ژن خواستن کەوتە نێوانیان، چونکە لەناوخۆیاندا بڕیاریان دابوو هیچ کەس ژن لەغەیری عەشیرەتی (بیگات) نەخوازێ ئەگینا ئەو منالانەیان دەکوشتەوە کە دایکیان لە عەشیرەتێکی ترە .

بەهۆی ئەم حاڵەتەوە عەشیرەتی (بیگات) تورکیای بەجێ هێشت و ڕوی لەتکریت و دەوروبەری کردووە کە لەوعەشیرەتەدا دەیان کەسی پیاو کوژو تاوانباری لەخۆگر تبوە .

کاتێکیش شۆڕشی ساڵی (١٩٢٠) کرا ، بۆ دەرپەڕاندنی ئینگلیز هەڵوێستی غەیری نیشتمانییان هەبووە، (صدام) لەم عەشیرەتەدا لە دایك بووە ، لەدایك و باوکێکی دڵ ڕەقی بێ بەزەیی خراپ.

هەرلەسەرەتاوە باوکی (صدام) دایکی لەماڵەکەی دەرکردووە و لەماڵی کەسێکی نزیکیدا بەناوی (مشحن) نیشتەجێ بووە لەگەڵ

(صدام)، پاش مانەوەی (صدام) و دایکی دوای هەفتەیەك، باوکی نەیدەزانی ڕویان لە کوێ کردووە واهەستی دەکرد چوون بۆ دێی (عۆجە)، کاتێك کەزانی لەماڵی (مشحن)ن بڕیاریدا بچێ هەر لەوێ دایکی (صدام) بکوژێت ! تا لەو ئابڕوچونە ڕزگاری ببێت ، لەو کاتەوە (صدام) هەستیبەتاوانباری دایکی دەکردو مەیلی بەلای باوکیدا بوو بەلام دەستی لە دایکیشی هەڵنە دەگرت، (مشحن) لەماڵەکەیدا باوکی سەدامی کردە دەرێ و تەهدیدی کرد کاتێك دەیویست (صبحە)ی دایکی (صدام) کە خێزانی خۆی بوو بکوژێت ، بەم جۆرە مانەوە لەماڵی (مشحن) تا ئەو کاتەی کە باوکی مرد، بەلام تائێستە هیچ سەرچاوەیەك هۆکاری مردنەکەی نازانێ ، هەرچەندە ناشزانرێ کە ئایا ئەو پیاوە (حسین مجید تکریتی) کێ بووە کەی و چۆن و بەچی و لەکوێ مردوە ؟

(ئەماتزیا بارام)ی دانەری کتێبی ( کلتورو مێژوو ئایدۆلۆجی لە پێکهاتنی بەعسییەکانی عێراق دا ١٩٦٨-١٩٨٩ ) بە تێڕامانەوەو دەڵێت : ( صدام خۆیشی گومانی لەوە هەیە کە کێ باوکێتی !وا بڵاوە کە باوکی ماوەیەك پاش لەدایك بونی صدام مردووە ، بەلام چۆن و لە کوێ ؟ پێش ئەوە چ ژیانێکی هەبووە ؟ نازانرێت ، هەندێ سەرچاوە باس لەوە دەکەن کەلەبەر ژنێکی تر دەستی لە (صبحە) هەڵگرتووە ) .

دایکی صدام ناوی ( صبحە طلفاح ) بوو خوشکی (خیرالله)یە ، ئافرەتێکی بالا بەرزی (فاڵگرەوە) بووە ، هەمیشە جلی ڕەشی لەبەر دەکردو گیرفانەکانی پڕبوون لە گوێچکەماسی و بۆ بەخت خوێندنەوە بەکاری دەهێنا ، کاتێك (صدام) لەسکی صبحەدا بوو ساڵی ١٩٣٧ فاڵێکی بۆ سکەکەی گرتەوە پێشبینی چارەنوسێکی خراپی لێ دەکردو دەیووت شەیتانێك لەسکمدایە ، تەمەنی (صبحە) ٣٠ساڵ دەبوو (صدام)

لەوکاتەدا لەسکی دایکی دا (٥-٧) مانگی دەبوو برایەکی تری هەبوو تەمەنی (١٥) ساڵ دەبوو ، توشی نەخۆشی (شێرچەنجە) بوو بوو ، بەو وەزعەوە هانای بردە بەر ماڵی ( سلیم زلخا )ی ، ئەم کەسە بازرگانێکی سەرمایەداری جولەکە بوو شەریکە ئیشی ( خیرالله ی برای و ابراهیم حسن ناوێك بوو ) ئەم ابراهیم حسنە دواتر دایکی صدامی مارەکردەوەو بوبە زڕباوکی صدام .

لە (ابراهیم حسن) صدام سێ براو خوشکێکی بوو زڕبراکانی بریتی بون لە:- ( بەرزان تکریتی - کە (ئیلهام)ی خوشکی ساجیدەی هێنا واتە زڕبراو ئاوەڵزاواشی بوو- سبعاوی لەگەڵ وەتبان )

(سلیم) سەربە خێزانێکی سەرمایەداربوو قۆنتەراتچی خۆراکی سوپای بەریتانی بوو ، لەو سەردمەدا هاتووە بەهانای (صبحە)وە لەوکاتەدا کە (صدام)ی لە سك دابووەو کوڕەکەی حاڵەتی خراپ بووە و تەنها سەیارەیەك لە تکریت دابووە خواستویەتی هێناونی بۆ نەخۆشخانەی ( المجیدیە) لە بەغداد بۆ سەردانی کوڕەکەی و دوای گەڕانەوەی لە نەخۆشخانە (صبحە) لەماڵی ژن خوشکێکی سلیم دەمایەوە بەناوی (ناظمة) کە پیاوەکەی ساڵی ١٩٥٠ کۆچی کردووە بۆ (ئیسرائیل) .

(گیل شیهی) نوسەری لێکۆڵینەوەی ( How Saddam survived ? ) ساڵی ١٩٩١ ( ناظمة)ی لە (ڕامات شەمرون)ی دەرەوەی (تەلئەبیب) بینیوە و دەڵێت : ناظمة وێنەی مێردەکەیی لەگەڵ خیرالله ی برای صبحەدا و تیپی دیدەوانی تاکە قوتابخانەی ئەوسای تکریت دا پیشان دام و وتی : برادەری خیرالله و مێردەکەم هەروا مایەوە و زۆر لە کوڕەکانی ناو ئەو وێنەیەش بون بەوەزیری حکومەتەکەی صدام ) ئەم

ئافرەتـە بیریـەتی پـاش ١٤ ڕۆژ لـە نەخۆشـخانە کوڕەکـەی صـبحە مـرد لەوکاتـەدا کـەوت بەسـەر دەسـتی سـلیم داو هەسـتایەوە ڕایکـرد بـەرەو سـەرجادەکە تـا خـۆی بکـات بـەژێر پاسـێك دا نەیانهێشـت ! شـەو لـە چێشـتخانەکەدا دەویسـت بەچـەقۆیەك سـکی هەڵبـدڕێت تـاخۆی و منداڵەکەشی بکوژێت ! تا سلیم فریای کەوت و هێوری کردەوە (صبحە) دەیگوت : من مێردم نەماوەو کوڕەکەشم مرد ، ئەم سکە خێری چی بۆ من ئەداتەوە ؟!

(ریا)ی کچی (سلیم) بیریەتی کە ئەم ژنـە (صبحە) هاتۆتـە ماڵیـان تـا لـەوێ منـداڵی ببێـت ، دەیبـینی کەچـۆن قـژی خـۆی دەڕنـی و بەسـکیدا دەکێشا و خۆی بەدارو دیواردا دەکێشا تا سکەکەی لەبار بچێت زۆر لـەو سکەی دەترسا ، ریا دەڵێ : ماوەیەك پێش ئەوەی سکەکەی لـێ ببێتـەوە ئەم ئافرەتە پێشبینی دەکرد سکەکەی شەیتانێکی تێدایە !

(صدام) لـەماڵی خـاڵی بـوو ( خـیراللە) مامۆسـتای سـەرەتایی بـوو ، سـاڵی ١٩٤١ بـەتاوانی بەشـداری کـردن لەڕاپـەڕینی دژبـە حکومـەتی پاشایەتی دەستگیر کرا ، پێنج سـاڵ زینـدانی بـوو ، صـدام بەناچاری گەڕایەوە لای زڕباوکە درۆزن و خراپ و دایکە فاڵچییەکەی .

پـاش مردنـی مێردەکـەی ، صـبحە تـەواو جڵـەوی بـەرداو بـەبێ شـەرمانە مامەڵـەی دەکـرد و دەگـەڕا ، (صـدام)یـش دوای سـاڵێك لەگـەڵ منداڵـەکانی خاڵیـدا ژیـا ، لـەو مـاوەدا دایکـی (صـدام) شـوی کردبـوو بەکابرایـەکی تـر کـە شـۆفێری ڕێگـای (بغـداد– موسـڵ) بـوو بـەناوی ( ابراهیم حسن )، ئەم پیاوە بەهۆی دزی مەڕو ماڵاتـەوە توانیبوی چەند پارچە زەوییەك پێکەوە بنێ و لەگەڵ (سلیم) ببێت بە شەریك ، زۆر کات (صـدام)ی لەگـەڵ خـۆی دەبـرد بـۆ (بغـداد) بەتایبـەتی لـەو جێگایانـەدا

دایدەنا کەشوێنی کەسانی خراپ و شەقاوە و ئاژاوە گێڕ بوو لە ناوچەی (الجعیفر) ، (صدام) لەو کاتەدا منداڵێکی عەبوسی سوك و بێ ڕێز و دەم و چاو ناشیرین بوو ، شکڵی هەر لە تاوانکار دەچوو لە چوار ساڵیەوە زڕباوکەکەی لە قوتابخانە دەری هێناو فێری دزی کرد .

(ئیناری ڕاوتسی و ئیفرەیم کارتش) لەکتێبەکەیاندا بەناوی ( صدام حسین : ژین نامەیەکی سیاسی ) نوسیویانە : ابراهیم حەسەنی زڕ باوکی چاوەڕێی دەکرد تا شەو صدام دەگەڕایەوە ، بەر لە شێو کردن و پشوو ، تێلایەکی بەقیر داپۆشراوی بۆ دروست کردبوو بەردەبووە لێدانی بەدەست و قاچیدا دەکێشاو بەجنێوی ناشیرین دەهاتەخواریٚ بە صدام و صبحەدا تا فێری بکات ئەگەر دز ئاشکرابوو لە کاتی دزیکردن دا چۆن خۆی دەرباز دەکات ؟ بەردەوام شەوانە زڕباوکەکەی و دایکی صدامیان دەنارد بۆ دزی کردنی مەڕو مالات لەو خێلانەی دەوروبەری تکریت ، هەمان شەو تالانیەکەیان بەش دەکرد و لە فرۆشتنی دا هیچیان بەشی صدام نەئەدا لەو زێڕو زیوو مەڕو مالاتەی بۆی دەدزین .

(صدام) لەوێوە فێری کوشتن و خوێن ڕشتن بوو کە لەکاتی دزیکردن دا ئاشکرا دەبوو هەرگیز شتە دزراوەکانی نەدەگەڕاندەوە بۆ خاوەنەکەی بەڵکو فێریان کردبوو هەرچوارپەلی مەڕو بزنەکانی دەبڕییەوەو سکی دەدڕین و بەدیاریانەوە پێدەکەنی .

لەتەمەنی نۆساڵیدا ماڵی زڕباوکەکەی جێهێشت و چویەوە لای خاڵی (خیرالله تلفاح) کەلەزیندان ئازادکرا ، خیرالله کەسێکی ڕەشۆکی و بەرتیلخۆرێکی بێ وێنەبوو، لەماڵەوە فێری چەك بەکارهێنانی دەکرد بۆیە لەتەمەنی ١٠ ساڵیەوە (صدام)بەچەکەوە دەبینرا لە تکریت دا و لەژیان نامەکەیدا باس لەوە دەکات کەبەبێ هۆ خەڵکی کوشتوە لەو

تەمەنەداو جارێك خاڵی ناردی بۆ كوشتنی خزمێكیان لە تەمـەنی ١١-١٢ ساڵیدا كاتێك زەلامەكەی كوشت گەڕایەوە ماڵ ، كە پۆلیس هاتنە سەری دوای یەك سـەعات لەئەنجامـدانی تاوانەكـە ، دەسـتیان كـرد لـە لولـەی دەمانچـەكەی بینیـان هیشـتا گەرمـە بـەلآم كـەڕایان دەوەشاند هەڵبسێت وتیـان ڕەنگـە ئـەم منداڵـە لـە ئێـوارەوە چـەندین سـەعات بێـت خـەوتبێت هێندە لە خەوێكی قوڵدا بوو گومانیان نـەبرد صدام ئـەو تاوانـەی ئـەنجام دابێت ، چونكە هەر لەو سەردەمەوە دروشمی ( بكوژەو بنوو )ی كردبویە بەرنامەی ژیانی .

سـاڵی ١٩٥٨ تەمـەنی صـدام (٢١) سـاڵ بـوو بـە فـەرمانی خـاڵی ( سعدون الالوسی) زاوایـی كوشـت ، لەسـەر ئەمـەش لەگـەڵ خـاڵی خرانـە زیندان .

(هانی الفكیكی ) ئەنـدامی ئەنجومـەنی سـەركردایەتی شـۆڕش بـوو ، بەرپرسی ئەو شانە حیزبیەی صدام بـوو دەڵـێ : صـدام هـەر لەمنداڵیـەوە حـەزی لـە ئەشـكەنجەدانی خـەڵكی بـووە و هـەر ئەمـەش ڕەفتـاری بـووە تاگەورەتر دەبوو زیاتر پێـی لـێ هەڵدەبڕی ، بـەجۆرێك لێـی كەوتبومـەوە گومانـەوە كـە ئایا صـدام شـێت نیـە ؟ ڕێـی تـێ دەچـوو شـێت بێـت ، گـەر كەسی دەست نەكەوتایە كەسە نزیكەكانی خۆی دەكوشت .

(ناظمـة)ش دەڵێـت : ڕیشـەی پیـاوكوژی صـدام ڕیشـەیەكی مێـژویی زۆر لە پێشینەی هەیە و دەتوانین بڵێین سایكۆلۆجیەتی سـتالین و صـدام زۆر لەیـەك دەچـن ، (بوخـارین)ی هاوچـەرخی سـتالین دەڵێـت : سـتالین خۆی بۆ نەدەگیرا تۆڵەی بەدبەختی و حاڵشڕی منـداڵی خـۆی لـە خـەڵكی نەكاتـەوە ، بەتایبـەتی لـەو كەسـانەش كەلـەخۆی باشـتر و بەهرەمەنـدتر بوون .

(بەرزان) کەبەرپرسی موخابەراتی عێراق بووە و دەستێکی باڵای هەبووە لەئەشکەنجەدان و کوشتن دا چونکە بەتایبەتی لە (ئەڵمانیا) و (سۆڤێت)ی جاران دەورەی ئازاردانی خەڵك و سیخوڕی و کوشتنی بینیوە.

(خیر الله تلفاح)ی خاڵی (صدام) ڕۆڵی بەر چاوی هەبووە لەژیانی (صدام) دا هەر لەو ساتەوەی کە هانی بۆ دزی و داوێن پیسی و حەشیشە و تلیاك فرۆشتن دا تائەو ساتەی کە خەڵکی پێ کوشتووە .

(صدام) بەزۆری لە ناوچەی (الجعیفر) دەبینرا لەگەڵ ئەو کەسانە کەلەژیان دا فاشیل بووبون و خەریکی بەدڕەوشتی و خراپەکاری بون ، هەموو ئەو کەسانە هاوڕێی بوون کە لەماڵ و کەس و کارو خەڵك هەڵهاتبوون . (صدام) کاتێك پەیوەندی بەحیزبی بەعسەوە کرد بۆ ماوەیەك (عبدالوهاب رمضان) بەرپرسی ڕاستەو خۆی بوو، لەوکاتەدا هەوڵی تیرۆر کردنی (عبدالکریم قاسمی) دا، دوای ئەوەی کە ڕۆژ ئاوا پیلانی کوشتنەکەی داڕشت بەتایبەت (بەریتانیا)، خەڵك دەیزانی ئەوانەی نەیاری( عبداکریم قاسم )ن قەومی و بەعسیەکانن . بەریتانیاش دەیویست جڵەوی دەسەڵاتداریێتی عێراق بگرێتە ئەستۆی لەڕێگای کوشتنی قاسمەوە بۆیە سەفارەتی (بەریتانی) پارەو ماڵێکی زۆری بۆ ئەو مەبەستە تەرخان کرد کە لەڕێگای (احمد) کەسێکی دانیشتوی ناوچەی (الصالحیة)ی بغداد بوو کە پەیوەندی بەسەفارەتی بەریتانی و (صدام) و کۆمەڵەکەیەوە هەبوو، ئەوبڕە پارەیەش (٥٠٠) هەزار دیناری عێراق بوو. هەر کەسێکیان (١٠) هەزار دیناریان بەرکەوت ، لەگەڵ دەمانچەیەکدا.

(صدام) و تاقمەکەی شارەزایی تەواویان هەبوو لە کوشتنیخەڵك و ئەشکەنجەدانیدا، (صدام) یش کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر جەماعەتەکەی هەبوو، ئەم پیلانە سەری نەگرت و ( عبدالکریم قاسم )یان بریندار کردو بۆیان نەکوژرا، دوای فەشەل هێنانی نەخشەکەیان هەندێکیان گیران و زۆریشیان هەڵهاتن و ڕایان کرد (صدام)یش ڕوی لەمیسر کرد ، لەقاهیرەی پایتەخت کارمەندێکی سەفارەتی بەریتانیا پێشوازی لێکردو لەوێ هەموو پێداویستییەکیان بۆ دابین کرد و ناوی لەکۆلیجی (ماف) تۆمار کرد تابخوێنێ و خەڵك گومانی هیچی پێ نەبەن پاش گەڕانەوەشی بۆ عێراق کە (عبدالکریم قاسم) لێبوردنی گشتی بۆ بڕیاردان ، لە زانکۆی بغداد پەیوەندی کرد بە کۆلیجی (ماف) ەوە بەمەرجێ هیچ خوێندنێکی لە سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیدا تەواو نەکردبوو ، بۆیە دەگێڕنەوە (صدام) لەو خوێندنەدا کە لەمیسریش بۆی ئەنجام نەدرا لەبەغدادیش دیار بوو کە لەو ئاستەدا نییەو بەردەوام خەریکی بەدڕەوشتی و جنێوو تەهدید بوو .

بەپێی ئەو سەرچاوە و بەڵگە نامانەی کە لەمۆزەخانەی بەریتانیا پارێزاون موچەی مانگانەی هەر ئەندامێکی کۆمەڵە شەڕەنگێز و عەسابەکەی لەگەڵ (صدام) بوون (٨٠-٢٠٠) دیناری عێراقی بووە کە (جورج ریمینکتون) دابینی کردووە، ئەو کۆمەڵە کەسەی کە لەگەڵ (صدام)دابوو پێیان دەوتن (عصابە قنی او حنین) هەمیشە خەریکی کوشتن و دزی و تالان کردنی ماڵی خەڵکی بوون.

پیاوێك بە ناوی (دکتور.ع) کە (صدام) لەنزیکەوە دەناسێت ، دەڵێ : مەحفەلی ماسۆنیەت کە لەبەغداد بوو (صدام) بەماوەیەکی کەم پەیوەندی

پێوە کردن، لەگەڵ (سەفیری ئیتاڵیا)ش هاوڕێیەتی تەواوی پەیدا کرد کە ئەو لەمەحفەلەکەدا بوو.

خیر الله تلفاح دەڵێ: مەحفەلی ماسۆنیەتی عالەمی نەخشەیەکی دوور مەدای بۆ ئەم وڵاتە داناوە، کە پێویستی بە جوڵانەوەیەکی چاك هەیە، کاتێك ئامادەبووان پرسییان چ پەیوەندیەك لەنێوان ئێوە و گەنجێکی وەك (صدام)دا هەیە ؟

ئەویش لەوەڵامدا ووتی: (مافیا) نابێ بپرسیت لە ئیش وکاری و زانیاری لە بارەی و زۆر شتی ژیانیەوە بزانیت، بۆیە (صدام) لەگەڵ مافیای دەولیدا پەیوەندی پتەوی بەستبوو ، خۆی و (عصابة قينى)، هەمووانیش پەیوندی نێوان ماسۆنیەتی جیهانی و بزوتنەوەی مافیا دەزانن لەچ ئاستێکی بەرزو باڵادایە، (دکتور.ع) دەڵێ : (صدام) و خاڵی بەتەنها دانیشتنیان لەگەڵ (سەفیری ئیتاڵیا و ریمنکتون) دا دەکرد پیاوانی ماسۆنیەتیش لە ڕۆژ هەڵات دا بریتی بوون لە بەعسیەکان کە (میشل عەفلەق – ی نەخشە دانەری فیکری و نەخشەدانەری سیاسی و کارت حنا – نەخشە داڕێژەری ئیعلامی و الیاسی فرح – ی بەرنامە داڕێژەری پەروەردەیی) ماسۆنیەت بوون ، بەم جۆرە (صدام) لای (ریمنکتون) ئیعتیبار و متمانەی تەواوی پەیدا کرد بە جۆرێ کە کاتی ئەوەهاتبێت (صدام) داواکاریەکەیان بەجێ بهێنێ دوای هەنگاوی یەکەم ، کە لەهەنگاوی دووەمدا کەسێکی شەقاوەو داوێن پیس و دزو تلیاك فرۆش و مافیا بهێننە پێش تا بیکەن بە دەسەڵاتداری عێراق و سەد لە سەد موتیعی خۆیان بێت دوای ئەوەی (ریمکتون) چەند دانیشتنێکی لەگەڵ (صدام) کردو (صدام)ی بەچەند کەسایەتیەك ناساند لەوانە (میشل عەفلەق)ی دروست کاری حیزبی بەعس ، بەبێ سنور یارمەتی

(صدام) و جەماعەتەکەیاندا تا بگەنە ئاستی پێویست بۆماسۆنیەت، لە ئینقیلابەکەی ساڵی (١٩٦٣)شدا کە بەعسیەکان تیایدا زۆر گیران لەوانە (صدام) و (احمد حسن بکر) پێکەوە ماوەیەکیان لە سجنی (الفضیلة) بەسەر برد.

کەسێ کە ناوی (عبدالرحمن)ەو لە نزیکەوە (صدام) دەبینێ باس لەو شەخسیەتە ڕوخاو و بێ ڕێزە دەکات کەلە ناو ئەو زیندانیە سیاسیانەدا چی لێ وەشاوەتەوە و بەچ شێوەیەك مامەڵەی کردووە ! دەڵێ لەو کاتەدا بوو کە لەسجن دا زۆرمان کرابوین بەجاسوس بەسەر هەندێکی ترەوە تا ئیعتراف لەسەر یەکتری وەربگرین (صدام)یش لەو ئینهیارە نەفسی و شەخسی‌یەدا بووکە تەواوی ڕێکخستنەکانی حیزبی بەعس لێك ترازا بون و پەرت ببون ، (صدام) بەیەك لێدان ناوی هەموو بەعسیەکانی عێراقی ئاشکرا کرد ، بەتایبەت ناوی (عبدالوهاب رمضان) ی دەبرد کە مسئولی ڕاستەو خۆی بوو ، (صدام) ئەویشی کوشت ساڵی (١٩٧٤) بە کارەساتی سەیارە هەرچەندە کەسێك بوو توانای حیزبی نەبوو، بەڵام (صدام) بە پێچەوانەوە هیچ شارەزایی و هۆشیاریەکی حیزبی نەبوو، دەڵێ : (صدام)ێکی وەها ڕووخاوو بێ ڕێز وداوێن پیس هەمیشە تەهدیدی سجنەکانی تری دەکرد بەبێ ئەوەی جورئەتی هیچ شتێکی هەبێ.

تادەڵێ : جارێك پێنج کەسمان پێك هاتین وتێرمان لە (صدام) دا. کەبەریش بووم و (صدام) بوبە سەرۆکی عێراق هەوڵی ئەدا لەڕێگای موخابەراتی سوری و ئەردەنی و لوبنانیەوە بمدۆزێتەوە و تۆڵەم لێ بکاتەوە.

یەکێك لەو کەسانەی کە لە قاهیرە (صدام)ی ناسیوە دەڵێ : دوای ئەوەی لە خوێندن کەوت و وازی هێنا لەبینایەکدا بوو منیش لەو شوقەیەدا بووم تەنها سەلاممان لەیەکتری دەکرد، بەڵام (صدام) مامەڵەو هەڵس وکەوتی زۆر نامۆو ناشیاوی لێ دەوەشایەوە کابرایەك هەبوو ناوی (مارونیا) بوو کەسێکی زۆر خراپ و سیخوڕ بوو سەر بەباڵوێزخانەی لوبنانی بوو جاسوسی بەسەر ڕێکخستنە ئیسلامیەکانەوە دەکرد.

(صدام) پەیوەندی بەهێزی لەگەڵ (مارونیا) هەبوو، هەمیشە خەریکی فەسادو داوێن پیسی بوون، هەموو شەوانێکی هەینی تەواوی سەرنیشینانی ئەو بینایەیان هەراسان و بێزار دەکرد.

دوای ئەوەی (عبدالکریم قاسم) بڕیاری لێبوردنی بۆ ئەو کەسانە دەرکرد کەلە تەقەلێ کردنیا بەشدار بون (صدام) گەڕایەوە بۆ عێراق ، لەو ماوەیەدا کە هاتەوە عێراق بێ ئیش و دور لەخوێندن بە زۆری لە ناوچەی (الجعیفر) دەبینرا، لەگەڵ کۆمەڵە ئینسانێکی تلیاك فرۆشی چەقاوە سوی دزو پیاو خراپ دا دەگەڕاو هەڵس و کەوتی دەکرد.

دوای شۆڕشی (١٩٦٣) هاوکاری لە نێوان قەومی و بەعسیەکان دا دژی (عبدالکریم قاسم) دروست بوو (صدام) بەرپرسی (حرس القومي) ناوچەی (الرصافة) بوو، کە لەگەڵ عەصابەکانیدا دەورێکی خراپیان هەبوو لە ئازار و ئەشکەنجەدان و کوشتنی خەڵکی دا، بەناوی پاسەوانی نیشتمانیەوە خەریکی تلیاك فرۆشتن و کوشتنی خەڵك بوون.

لە (١٨)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٦٣) دا کە (عبدالسلام عارف) ئینقیلابی کردبەسەر بەعسیەکاندا لە سوڵتەدا (مشیل عەفلەق و امین الحافز و الیاس فرح و منیف الرزاز) بەفڕۆکەیەك هەڵهاتن بۆ فەرەنسا و

((صدام) و احمد حسن بكر)یش ماوەی (شەش) مانگ لەزیندانا مانەوە، (احمد حسن بكر) كە ئەندامی باڵای حیزبی بەعس بوو لەعێراق دا توشی نەخۆشی نەفسی بوو دورخرایەوە بۆ زیندانی سەربازی (التاجي) دوای ئەوەی مانگێك لەوێ هێڵدرایەوە دواتر ئازاد كرا لەكاری سیاسی دوركەوتەوە و ژیانی بەبەخێو كردنی مانگاوە سەرف دەكرد.

بەڵام (صدام) هیچ پەندێكی لەبەندیخانە وەرنەگرت و لەسەر هەمان ڕەوتی خۆی درێژەی بەتاوان و كوشتن و دزی و خراپە كاری دەدا.

دوای ئەوەی كە چووە سەر حوكم لەساڵی (١٩٦٨) تەواوی ئەو كەسانەی لەحەوزی تێزابدا سوتان كە پۆلیس و لێكۆڵەرەوە بوون لەكاتی زیندانی كردنیا، هەر كەسێكیان دەست كەو تبێ و ناسیبنیەوە بەو دەردەی بردووە.

لە ئینقلابی چونە سەر حوكمی بەعسیەكانیش دا كەسی یەكەمی ئەو پیلانە (جورج ریمنكتون)ی سەفیری بەریتانی بوو كە عەقڵی فیكری و بەرنامە داڕێژەری یان بوو (صدام)یش ئەمەل و زەخیرەی دەسەڵاتدارێتی ئایندەی عێراق بوو لای (ریمنكتون) كە زۆر هۆكار یارمەتی (ریمنكتون) ی‌دا بۆ ئینقیلابەكە لەوانە:

١- زۆر كەس ولایەنی بەهێزی حكومەتەكەی (عبدالرحمن عارف) كە پشتیان پێ بەسترا ئەوانیش (عبدالرزاق نایف ، ابراهیم الداود، حردان تكریتی) كە یەكەمیان بەڕێوەبەری موخابەرات و دووەمیان بەرپرسی هێزی كۆشكی كۆماری و سێیەمیان سەرۆكی هێزی ئاسمانی بوو. هەروەها لەگەڵ (طاهر یحیی) ی سەرۆك وەزیرانیش دا زۆر شتیان كرد بوو كە سەربە عەشیرەتە تكریتی یەكان بوو.

٢- سودی لە هێزە قەومی و چەپەکانیش بینیبوو بۆ لابردنی حوکمی عبدالرحمن، لەو کاتەشدا (عارف) لاواز بوو بوو لەدەسەلاتداریتی یەکەیدا کە ئەمەش هۆکارێکی تری بەهێز بوونی پیلانەکە بوو بۆ سەرگرتن.

٣- پاڵپشتی بەهێزیش بۆ بەعەمەلی کردنی ئینقلابەکە (صدام) و عەسابەکانی بوون کە هەڵوێستیان دژ بەدین و شیوعیەکان چەشکراو بەدڵی ماسۆنیەت بوو هەروەها شارەزاییان لە شۆڕش و ئینقلابەکانی ٨ی شوبات و (١٨) تشرین دا هەبوو ، متمانەشیان لای ڕۆژ ئاوا پەیدا کردبوو، بەهۆی ئەو ئەزمونە بەعسیەشەوە کەلە سوریا لەپێش چاوبوو بۆ غەرب و پیەی چاك بوو بەعسیەکان ببنە دەسەلاتداری عێراق.

جیهانی نەسرانی و کەنیسەش، باوەڕی تەواوی بە حیزبی بەعس پەیدا کرد بوو بەتایبەتی لەڕێگای میشیل عەفلەقەوە، کە سەرکردەیەکی ڕۆحیو بەرنامە داڕێژەریان بوو.

(صدام) لە تەمەنیدا خۆی و کۆمەڵە شەڕەنگێزو شەقاوەکەی ، باڵوێزخانەی (بەریتانیا) گرنگی زۆریان پێ دەداو هەموو توانایەکیان بۆ تەرخان کرد بوو تابیکەن بەو دیکتاتۆرە خوێنڕێژە . ئەوەبو خۆی و (٢٠) لەهاوڕێ خراپەکانی لەلایەن باڵوێزخانەی بەریتانیاوە برانە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا بۆ ماوەی (١٠) ڕۆژ مەشقی جۆراو جۆریان پێکردن لەسەر شەڕی عەسابات و شەڕی جادەو هۆکارەکانی ئەشکەنجەدان و کوشتن و .... هەمان ئەو فڕۆکەیەش گواستنیەوە کە (ریمنکتون) مانگانە پیەی دەگەڕایەوە لندن ، لەسەر ئەو بنەماو پرانسیپەش مەشقیان پێ دەکردن کە هەموو ئینسانێك تاوانبارە بۆ ئەوەی بەبێ تاوانی دەربچێت پێویستە بهێنرێ ئەشکەنجەو ئازاری جۆراو جۆری بدرێت تا دان بە

تاوانەکەیدا ئەنێ ، ئەگەر هات و هیچی نەدرکان ئەوە بێ تاوانەو ئازاد دەکرێت . هەموو ئەو کەسانەش کەلەگەڵی برانە ئەڵمانیا دواتر لە ساڵی حوکمڕانی بەعس دا کرانە بەرپرسی ئەمن و موخابەرات بۆ چەوساندنەوەی خەڵکی مەزڵومی عێراق .

(صدام) خودی خۆی لە ساڵی (١٩٧٧) دا سەرپەرشتی ئەشکەنجەدانی هاوڵاتیانی دەکرد، چونکە کەسێکی خوێنڕێژو تاوانکاری وای لێ دەرچوو بوو کەبەبینینی خوێن و ئازاردانی ئینسان، چێژی خۆشی وەردەگرت و دەحەوایەوە.

(صدام) بەدەستی خۆی تەعزیبی زیندانیەکانی دەدا، زۆرێک لەوانەی کە ئازاد بوون دەڵێن : چاویان بەپارچە قوماشێك دەبەستینەوە تا (صدام) نەناسینەوە ئەوسا دەهات بە جۆرەها شێوازی دڕندانەو وەحشیانە ئەیخستینە ژێر ئەشکەنجەو لێدان.

عەسابەکانی (صدام) بریتی بون لەدوهێڵی سەرەکی، یەکەمیان (١٠-١٥) هەزار پیاو کوژو وەحشی بون ، کەپەیوەندی ڕاستەو خۆیان بە (نوسینگەی (صدام)) ەوە هەبوو لە ( مجلس الوطنی) دا .

لەهەر بینایەکی دا (٧٠٠) کەس وجودیان هەبووە و جڵەوی کارەکانیان لەدەستدا بووە.

هێڵی دووەم ژمارەیان (١٥) هەزار کەسەو پەیوەستن بە هێڵی یەکەمەوە و خەریکی جاسوسی کردن بون لەسەر ئەو کەسانەی کە گومانیان لێ بکەن دژ بە بەرژەوەندی (صدام)ن، دەستبەجێ ونی دەکەن و دەیکوژن.

(صدام) لەڕوی تەندروستیەوە تەواونی‌یە و بەردەوام لە ژێر چاودێری دکتۆردایە، ساڵی (١٩٧٩) کەپزیشکێکی سویدی هات بۆ

چارەسەرکردنی (صدام)، پزیشکێکی دەروونناسی زۆر بەناوبانگ بوو، خاوەنی دەیان نوسراو بوو لەو بوارەدا، کاتێك لە نەخۆشخانەی (ابن سینا) بوو گواستیانەو بۆلای (صدام) ، داوای وەرگێڕیان کرد بۆ قسەکان بەڵام زاناو پزیشکە سویدیەکە ووتی : لەبەر ئەوەی نەخۆشیەکە نەفسی‌یە پێویستە ڕاستەوخۆ قسەکان لەخۆیەوە ببیستم ! کاتێك دکتۆر دەیپرسی لە (صدام)، (صدام) کەمێك تێ دەگەیشت و دەشیتوانی وەڵام بداتەوە، پێی ووت : من زەرورم بۆ عێراق و پێویستە عیلاج بکرێم چونکە بڕیاردانی هەموو شتێ لەم وڵاتەدا لەسەر منەو ئەبێت ڕەق و توندو تیژبم .

دوای ئەوەی دکتۆر زانی کەسێکی پیاو کوژی خوێنمژە و تەنها بە کوشتن چێژ وەردەگرێت بڕیاریدا چارەسەری نەکات، دوای هاتنە دەرەوەی لە کۆشکی کۆماری کوشتیان و نامەیەکیان دا بە حکومەتی سویدی گوایە بەنەخۆشی مردووە ، ئەوانیش ناڕەزایی نامەیەکی توندیان ئاراستەی (دادگای نێودەوڵەتی لاهای)و هەموو وڵاتانی جیهان کرد سەبارەت بەو تاوانە بێ وێنەیەی بەرامبەر زاناو پزیشکێکی دەرونی کە(صدام) ئەنجامی داوە.

حکومەتی سویدی لەڕێگای باڵوێز خانەی خۆیەوە داوای (١٥٠)ملیۆن دۆلاری کرد لە بەرامبەر خوێنی ئەو پزیشکەدا و پارێزەری خۆشی بۆ داواکەی گرت لە (دادگای نێو دەوڵەتی لاهای)، ئەوە بوو عێراق پارەکەی تەسلیم کرد بەحکومەتی سویدی و مەسەلەکەی کۆتایی پێهێنا، دواتر (صدام) لەلایەن کۆمەڵێك پزیشکی ترەوە لە زۆر دەوڵەتی جیاوازەوە چارەسەر کرا بەتایبەتی (دکتۆر زوکرمان) کە مامۆستای زانکۆی (جورج واشنتن) بوو لە وڵاتە یەکگرتووەکانی امریکا و کەسێکی

یەهودی بوو لەسەر داوای (ریمنکتون) ئەو چارەسەرەی بۆ (صدام) ئەنجام دا.

(صدام) کەسەکانی دەوروبەری خۆی بە جۆرێك ڕاگرتووە لەسەر بنەمای سیاسەتی (جوع کلبك یتبعك) سەگەکەت برسی بکە دوات دەکەوێت ، وە هیچ کەس لەوانەی دەوروبەری خاوەنی شەرەف و کەسێتی و بونی خۆیان نەبون ، (دکتۆر تحسین الملا) ئەندامی پێشوی هەڵبژاردەی بەعسی لەناوچوو دەڵێت : صدام ناهێڵێ هیچ کەس لەوانەی دەوروپشتی خۆی خاوەنی شەرەف مرۆڤانە بێت دەبێ وەزیرەکانی و تاریق عەزیز و ئەندامە گەورەکانی و هەموو کەس وا پیشان بدەن کەتەواو لەخوار خۆی و پاسەوانە شەخسیەکان و بنەماڵەکەیەوەن ، خیرالله ی خاڵی وەك نوێنەری عێراق سەردانی ئەردەنی کرد و لەبەردەم چل کەس لەوەزیرەکانی عەممان دا کە بۆ پێشوازی کردنی هاتبونە ئوتێل ( ئینتەر کۆنتینتال ) شانازی بەوەوە دەکرد و دەیگوت : ئێمە لە عێراق دا بەرلەوەی هەر پیاوێك بکەین بەوەزیر لەدواوە سواری دەبین !!

(صدام) لەکاتی هاتوچۆیدا (١٠-١٢) سەیارەی رەشی مارسیدس کەیەکی پێنج کەسی تێدایە بەشۆفێرەکەوە، یەك جۆر جلوبەرگیان پۆشیوە و جامەکانی تاریکن، کەس نازانێت(صدام) لە کامیاندایە، بەڵام سواری هیچ لەوسەیارانە نابێت بەڵکو لەسەیارەیەکی ئاسایدا سوار دەبێت کەتێکەڵ بە پاسەوانەکانی بووە ، تاهەستی پێ نەکرێ، چونکە زۆر هەوڵی‌تیرۆر کردنی دراوە بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، بۆ نمونە لە ڕێگای (بغداد) تەقەی لێکراو چەند پاسەوانێکی کوژرا (صدام) هیچی بەسەر نەهات، بەهێلیکۆپتەرێك خێرا گواستیانەوە بۆ بغداد. زۆر کاتیش درعێکی دژبە فیشەك لە ژێر جلەکانیەوە لەبەر دەکات ، یان جلێك لەبەر

دەكات كە لەئەڵمانیای ڕۆژئاوا بۆی دروست كرابوو بەنرخێكی خەیاڵی فیشەك كاریگەر نەبوو لەسەری . هەوڵی كوشتنی (صدام) لەلایەن زۆر كەسەوە دراوە ئەوانی لەڕێگای حیزبی بەعسەوە باسی كراون بۆ هەوڵی كوشتنی (صدام) بریتین لە (فازل محمد علی كەپاسەوانی عبدالرحمن عارف بوو) ، (ابراهیم محمد علی كیكی) و ..... چەند كەسێكی تر.

(صدام) كۆشك و خانوی جۆراو جۆری لەشوێنە جیاوازەكانی بغدادا هەیە، دوای ئەوەی داوای (ساجدە) ی كچی خاڵی (خیر الله تلفاح)ی كرد (ساجدە) ئافرەتێك بوو خوێندنی تەواو كرد بوو لە سەرەتاوە ڕازی نەبوو، (خیر الله) ش باش (صدام)ی دەناسی كەچ پیاوێكە، بەڵام بەزۆر مارەی كرد لێی ساڵی ١٩٦٣، هەرچەندە پەیوەندی بەهێز لە نێوانیان دا دروست نەبوو پاش خواستنی، چونكە (صدام) متمانەی بەكەس نی یەو ساجدەش دەیزانی لەگەڵ كێی ترداو بەچ شێوەیەك خەریكی تێركردنی ئارەزوی سێكسی یە، كاتێك لەگەڵ (ام غانم) لەگەرەكی (نضال) ڕایدەبوارد بۆماوەیەكی زۆر لەساجدە جیابوبووەوە ، پاشان حەزی لە ئافرەتێكی تر كرد بەناوی (سمیرە شهبندر) ، ئەم ئافرەتەش خزمەتكارێكی خۆی بەناوی (ججو) بۆی دۆزیەوە ، سمیرەی لەخۆی مارەكردو بەكابرای تەڵاق داو لەپاداشتا مێردەكەی كردبە وەزیری هێڵی ئاسمانی عێراق ، ئەوكات ساجیدە خاوەنی پێنج منداڵ بوو، كە بەمەیزانی هانای بردە بەر ( بەرزان تكریتی ) چونكە جارێكی تریش صدام پەیوەندی بەستبوو لەگەڵ ئافرەتێك ، ساجیدە بەرزانی ڕازی كرد كە مێردەكەی ناچار بكات ژنەكە تەڵاق بدات و ئافرەتەكەشیان دەركرد بۆ توركیا ، بەڵام بۆ مەسەلەی سمیرە شهبندر لەوكاتەدا بەرزان نێردرایە دەرەوەی عێراق ، ساجیدە پەنای بردە بەر (عودە)ی كوڕە گەورەی ،

چونکه هەرچەندە بەرزان زڕمامی بوو (سەجا)ی کچیشی دابوو بە عودەی (سجا) کچی پوری خۆی بوو .

ساجیدە عودەی تێگەیاند کە لەمەترسیدایە بۆیە عودە هەستا و چویە ئەو ژورەی کە حزمەتکارەکانی (صدام)ی تێدابوو ، ژورێك بوو تەنیشت هۆڵی ئاهەنگ گێڕانی ژنەکەی (حسنی مبارك )ی سەرۆکی میسر بوو ، عودەی بەتێلاً ئەو ئافرەتەی کوشت کەلەگەڵ باوکی دەستی تێکەڵ کردبوو ، ئەو ئافرەتە کەناوی (ججو) بوو تەمەنی (٢٠) ساڵ بوو نەمسوڵمان بوو نە تکریتی ! لەسالأنی حەفتاوە صدام هێنابویە ناو خزمەتکارەکانی .

دوای کوشتنی ئەو ئافرەتە صدام بڕیاری دادگایی کردنی عودەی دەرکرد ، دواجار ناردیە سویسرا ، لەوە بەدووا صدام نانی دەستی ساجیدەی نەخوارد چونکە دەیزانی پیلانی ئەو بووە ، دوای چەند مانگێك صدام ئەوکات هێشتی عودە بگەڕێتەوە عێراق .

(عودە) لەگەڵ (لؤي) کوڕە بچوکی (خيرالله) بەردەوام خەریکی داوێن پیسی و فەساد بوون لە بەغدادو جنێف ، پەنجەی بۆ هەر ئافرەتێك درێژ بکردایە دەیهێنایە کۆشکەکانی باوکی و اغتصابی دەکرد و زۆجار دەشی کوشتن .

(صدام) پەیوەندی بەتینی لەگەڵ (یەکێتی ئافرەتانی عێراق) دا هەبوو بەتایبەت لەڕێگای سەرۆکی یەکێتی یەکەوە، هەرئافرەتێکی بەدڵ بووایە بەویستی خۆی داوای دەکردو لەگەڵی ڕایدە بوارد، (صدام) بە ئاشکرا داوای ئیباحیەتی دەکردو دەیوت : چۆن ئینسان بۆتێر بوونی پێویستی‌یە ئابوریەکانی شتومەك و خۆراکی جۆراو جۆر بەکار دێنێ

دەبێت ئاواش ئافرەت پەیوەست نەبێت بەیەك پیاوەوە، یان پیاو بەیەك ئافرەتەوە.

لەناو منداڵان و کچانیش دا (٤) ڕێگای بۆ فەساد ئاسان کردبوو بە تایبەت لە (حدیقەی زوراء) و زۆر جێگای تر، ئەو حاڵەتانە بەڕادەیەك گەشتبوون کە (٣٠ ./.) ڕادەی خواردنەوەی عەرەق و قومار لەباڕەکاندا دروست بو بوو، بەڕێژەی (٤٠ ./.)یش حاڵەتی زیناکردن و کوشتن و ئیغتیساب دروست بوو بوو، بەهۆی زانیاری و ڕاپۆرتی پۆلیس و نەخۆشخانەوە ئەم ئامارانە بە دیار خراون.

دکتۆرەیەکی نەخۆشیی ئافرەتان کە لەنەخۆشخانە تایبەتمەندبوو بەتەندروستی ئافرەتانەوە دەڵێ : لە ساڵی (١٩٧٨) دا تەنها لەناو قوتابیە کچەکانی قۆناغی ناوەندیدا لە بغداد (٨٠٠٠) حاڵەت ڕویدا بوو کە کچێنیان لەدەست داوە ، بەهۆی ئەو فەساد و بەرەڵایی یەوە، ئەمە لەناوەندیدا ڕویداوە، داخۆ لە ئامادەیی و زانکۆکان دا چی قەوما بێت . لەکاتێکدا پاش خوێندن یان لەکاتی مەشقی (جیش الشعبی) دا لەسەربازگەی تێکەڵا کوڕان و کچانیان دەخەواند.

ساڵی ١٩٨٣ ناکۆکیەکی زۆر گەورە لەناو بنەماڵەی صدام دا تەقیەوە ، (حسین کامل ) یەکێك بوو لەو کەسانەی مونافەسەی توندی صدامی دەکرد و توانی بەزۆر (ڕەغدە)ی کچی صدام مارەبکات ، لەماوەیەکی کەمیش دا بوو بە (سەرۆکی هێزی ئاسایشی صدام) دکتۆر (صلاح الشیخلی) ڕاوێژکاری وەزیری دەرەوەی عێراق کە لە لەندەن دەیخوێند پێشتر دەڵێ : لەساڵانی حەفتادا حسین کامیل چاوەشێك و عەریفێکی سوپا زیاتر هیچی تر نەبوو! بەڵام هێندە هەبوو ئامۆزای صدام بوو لەزڕباوکیەوە . هەرچەندە بەرزان تکریتی دەیویست (ڕەغدە)

برازای بخوازێت بۆ کوڕەکەی هەروەها ساجیدەش لایەنگری بەرزانی دەکرد چونکە خوشکەکەی ساجیدە ژنی بەرزان بوو ، بەڵام حسین کامل گرەوەکەی بردەوە و هەوڵەکانی سەری گرت بۆ خستنەوەی ناکۆکی لە نێوان بەرزان و صدام ، توانی (ڕەننا)ش کە کچی صدام بوو بخوازێت بۆ (صدام کامل)ی برای .کاتێك عودەو ساجیدەو بەرزان چونە پاڵ یەك دژ بە صدام ، کەوتنە بەر زەبری توندی صدام ، ساڵی ١٩٩٥ صدام وەتبانی لادا و عودەی تەقەی کرد لەوەتبان و لەجێگادا خستی ، دوای ئەمە حسین کامل و براکەی هەڵهاتن لەعێراق بەرەو ئەردەن ، ( ٢٠ی شوباتی ١٩٩٦) صدام حسین کامل و براکەی و کچەکانی بەخشی و کە گەڕانەوە بەغداد بە سەرکردایەتی ( علی حسن المجید) حسین کاملی کوشت ، پێشتریش عەدنان خیراللە ی خاڵوزاو ژنبرای خۆی کوشتبوو ، ماوەیەکی زۆریش خیراللە ی خاڵی خستە ژێر ئیقامەی جەبری . زڕخوشکەکەی دابو بە ارشد یاسینی پاسەوان و سایەقی فڕۆکە تایبەتیەکەی .

(جورج ریمنکتون) لەدوا یاداشتی‌دا کە نوسیویەتی پێش دەست لەکار کێشانەوەی دەڵێ : ( هەستمان بەوەکردبوو کە پەیوەندی بەهێز لەنێوان (صدام) و (ئەمریکا) دا هەیە ، کە پەیوەندیەکە بەشێوەیەکی زۆر غەریب و سەرسورهێنەر بوو، دەڵێ : حکومەتم لە ئایندەی ترسناکی ئەو پەیوەندیە ئاگادار کردەوە، (صدام) لەڕێگای (فەهد و حسین) ەوە- کەدوو کار بەدەستی گەورەی ئەمەریکی بوون لەلایەن (کارتەر)ەوە لەئەردەن دانرا بون- پەیوەندی هەبوو، کە بەشەخسی لەگەڵ (فانس) لە سعودیە دادەنیشتن و لەگەڵ (بریجنسکی)ش دادەنیشتن، لێرەوە (ئەمریکا) ڕۆڵی بەریتانیای لابرد لە سەر عێراق و خۆی هاتە پێش. دڕندەیی (صدام) لەوێوە پێش چاوی خەڵکی عێراق کەوت کە ڕووبەری

ڕاپەڕینە جەماوەریەکان دەبویەوە بە جۆرەها شێوازی دڕندانەی نامرۆیی و لەیەکەم کاریدا ناوی (٣٠٠) کەسایەتی فیکری و ئاینی و زانستی خستە بەردەم (احمد حسن بكر) تا ئیمزای لەسێدارەیان بکات ، بەڵام (بكر) ئیمزای نەکردوو داوای لە (صدام) کرد کەدان بەخۆیدا بگرێت و بەئارامی دەست بەسەر ڕاپەڕینەکاندا دەگرن، (صدام) بەمە ڕازی نەبوو هەر سوربوو لەسەر بڕیارەکەی خۆی تاڕوی کردە (بكر) وپێی ووت : ( إذا لم توقع فانك سوف تنال نفس المصير ) بکر پاش ئەم قسانە (هەیسەم) ی کوڕی ئاگادار کرد کە (صدام) بکوژێ پاش ئەوەی هەوڵی تەقە کردنیدا لە (صدام) بەڵام بەهۆی پاسەوانێکی تایبەتی (صدام)ەوە نەهێڵرا، (صدام) (بكر) ی تەهدید کرد بەوەی کە (هەیسەم) دەکوژێ یان ئەبێت لەسەر شاشەی تەلەفیزیۆن بەئاشکرا واز بهێنێ ! ئەوسا هەیسەمی ئازاد کردو (بكر) لەماڵی خۆی دانیشت لەگەڵ ئەوەشدا وازی لێ نەهێناو بەڕێگایەکی تر لە ناوی برد ، دواتر ووتی بەنەخۆشی مرد.

(صدام) پاش (بكر) حوکمی کوشتنی (٣٠٠) کەسەکە ، بڕیارەکەی جێبەجێ کردو هەموو کەس و کارەکەشیانی بێ سەرو شوێن کردن و خۆی بوو بەودیکتاتۆرەی کە کەس نەیدەتوانی لە بەرامبەریدا بوەستێتەوە.

لە عێراق دا هەرلاوێك بیویستایە ژیانی مسۆگەر بکات ئەوا دەبوو بەعسی بوایە هەروەك (سمير هزاع) سەربە پیشەسازی سەربازی عێراق بوو پێش داگیر کردنی کوێت هەڵهات لە عێراق دەڵێت : ( لەعێراق دا هەرلاوێك بیەوێت ژیان و پاشەڕۆژی مسۆگەر بکات ، باشترین ڕێگە لەبەردەمیدا ئەوەیە بچێتە نێو ڕیزی حیزبی بەعس ، بەڵام دەبوو لەتاقیکردنەوەی ناهەمواری سزای سۆندەو زیندانی ئینفیرادی و

جۆرەهـا ئەشـكەنجە سـەركەوتوبن ئەوكاتـە پـارەو سـەيارەو زەوی و خانویان دەدرایە ، ئەو كەسانەش لەگەڵ ناونوس دەكران ئیتر خەڵكی لێیان دەترسان .... (هزاع) ئەوە دەگێڕێتەوە كە جارێك لە ناوچەیەكی بغداد ئەفسەرێكی ئەمن بۆ بینینی ئافرەتێك لە كاتی خۆی دواكەوتبوو سایەقی شۆفێرێكی كوشتبوو ، سەیارەكەی بردبوو دواتر كە سەیارەو لاشەی شۆفێرەكە دۆزرایەوە تاوانبارە بەعسیەكە وتی : پەلەم بووەو سەیارەم دەست نەكەوتووە ئەوەنەبێت ، كەس نەیتوانی سەرزەنشتی بكات !! هزاع دەڵێت : لەسەرەتای ساڵانی حەفتادا سەدام دەگەڕا بەدوای ئەو منداڵە هەتیوو زۆڵ و بێلانانەدا كە دەركراوو بێلانەبوون تا لەدەزگاكانی ئەمندا دایان بمەزرێنێت .هەمو ئەو بەعسیانەی دەوری سەدام هەر شەش مانگ جارێك یەكی سەیارەیەكی تویوتای سوپەر سالۆنی دەدانێ كە بایی پارەیی‌كی زۆرە ، هەموو ساڵێكیش پارچە زەوییەكی دەدانێ كە لەفرۆشتنەوەیان دا سەربەست بوون .

هزاع ئەوەش باس دەكات كە پیاوە پلە یەكەمەكانی دەوری سەدام سەرەتا پاسەوانی شەخسی ( صدام ) بوون لەدەستەی پاسەوانانی تایبەت ، خراپترینی ئەو دەستانە دەتوانێت فەرمان بەسەر گەورەترین وەزیردا بكات سەرەتا ئەم دەستەیە (حسین كامیل)ی زاوای سەرپەرشتی دەكردن .

( تحسین بشیر )ی باڵوێزی عێراق پێی وایە سەدام دەیویست وەك (هارون الرشید) خۆی نیشان بدات و دەسەڵاتێك دروست بكات وەك ئەو سەردەمەی ئیمپراتۆریەتی (عەباسی) لێ بێت سنوری دەسەڵاتەكەی زۆر جێگای وڵاتان بگرێتەوە .

( تۆفیق سالّح ) فیلمسازی میسری دەڵێت :-( سەدام ویستی لاسایی (هارونە ڕەشید) بکاتەوە ، ترس و بەرتیلی کردبووە ستراتیجی خۆی . ئەم دەرهێنەرەی میسر ڕاسپێردرابوو لەلایەن سەدامەوە فیلمێك لەسەر ژیانی سەدام دەربکات !! )

(دکتۆر نەجمەدین کەریم )ی نەشتەرگەر لە نەخۆشیەکانی (دەمار) لە(واشنتۆن) دەڵێت ( سەدام بەر لەوەی ببێت بە سەرۆك کۆمار شێتی مەزنایەتی بوبوو ! صدام شەیتانەو زۆر ڕەفتاری لەدیمەنی شانۆیی دەچوو ، بە نمونە بۆیە حەزی دەکرد یاسر عرفات ببینێت چونکە عرفات لەخۆی بچوکتر بوو دەبوو سەدام بەسەریدا بچەمێتەوەو عرفاتیش تەنها دەمی بەشانی دەگەشت ماچی بکات ، وەزۆر حەزی دەکرد (مليك حسين ) سەردانی بکات چونکە ئەویش بالآی کورت بوو شانی ماچ دەکرد)

لەسالآنی هەشتادا سەدام خۆی لە ( شا حسين ) نزیك کردەوەو سودی زۆری لیّ بینی بەهۆی بازرگانی (چەك)ەوە . لەگەلّ (ڕۆبێرت گەیت )ی یاریدەدەری ئاسایشی نەتەوەیی زانیاری زۆری موخابەراتی دایە ( بۆش) سەبارەت بەوەی ئەردەن کراوەتە پێگەیەکی ناڕەوای چەك ناردن بۆ عێراق ، شا حسين لەسالآنی(١٩٨٥-١٩٨٩) دەلآلّی کڕینی چەك بووە بۆ سەدام .

(شا حسين) زۆر لە صدام دەترسا وەك ( عبدالله سالّح )ی بالّویّزی ئەردەن لەنەتەوە یەکگرتووەکان دەڵێت : (شا حسين سلّ لە صدام دەکاتەوە ، پرسیم ئەمە چی دەگەیەنێت ؟ ترس یان ڕێزگرتن ؟ لەوەلآم دا گوتی هەردوکیان !! )

دپلۆماتێکی ئەردەنی کچەکەی دەیگێڕێتەوە : باوکم چاوی بەهەموو ڕێبەرانی جیهانی عەرەب کەوتووە و بۆ هیچیان ئەو ترسەی لیّ

نەنیشتووە کەلەگەڵ صدام توشی بووە ، بەتایبەت کاتێك لەگەڵ (شا حسین) سەردانی صدامی کردووە ، دەڵێت تەماشاکردن و چاوتێبڕینی هێندە ترسناکە مرۆڤ دەخاتە شڵەژان و ترس ، بەتایبەت لەو دانیشتنەدا باوکم هەستی بەوە کردووە کەصدام کۆئەندامی دەماری تەواو نیەو نەخۆشی دەماری هەیە بەهۆی ئەوەوە کە زۆر بەگەرمی پێڵوی چاوی دەهێنێتەوە یەك و هەڵی دێنێت !.

دکتۆر (صلاح الشیخلی)ی کۆنە وەزیر دەڵێت : تەماشاکردنی صدام مرۆڤ لەخشتە دەبات ئەگەر ڕاستەوخۆ بڕوانێتە چاوت ، دەبێ خۆت ڕابگری .

(ئێفرەم کارش)ی پسپۆڕی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەڵێت (صدام) پسپۆڕێکی ڕەچەڵەکناس (عالم الاسناب)ی ئەردەنی ڕاسپارد کە شەجەرەیەکی بۆ دروست بکات تا بیگەیەنێتەوە بە بنەماڵەی هاشمی و خودی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) ، ئەمەشی لەبەر دوو هۆکار بووە لەلایەك توانی بەم شەجەرەیە میراتی باوکی شا حسین بۆخۆی وەربگرێت ، لەلایەکی ترەوە بۆ ململانێی لەگەڵ بنەماڵەی (ال السعود)ەکانی کەنداو ئەمەی دروست کرد ، بەپێی ئەو شەجەرەیە صدام بەم جۆرە خۆی دەگەیەنێتەوە بە پێغەمبەر(صلي الله عليه وسلم) :

(صدام --- حسین --- عبدالمجید --- عبدالقادر --- عمربك الثاني --- بكر بك --- الامیر عمر --- الامیر شبیب --- الامیر حسن --- الامیر علی --- الامیر حسین --- الامیر عبدالناصر امیر عباده --- الامیر حسین العراقي --- السید ابراهیم العربي --- السید محمود --- السید عبدالرحمن شمس الدین --- السید عبدالله قاسم نجم الدین --- السید محمد السلیم --- السید شمس الدین

عبدالكريم --- السيد صالح عبدالرنان السيد --- السيد شمس الدين محمد --- السيد صدرالدين على --- القطب ابي على احمد الصياد --- القطب عبدالرحمن الدولة --- السيد سيف الدين عثمان الرفاعي --- السيد حسن --- السيد محمد --- السيد الحازم علي ابو الفوارس --- السيد احمد --- السيد علي --- السيد الحسن الرفاعة المكى --- السيد المهدى --- السيد ابي القاسم محمد --- السيد الحسن --- السيد احمد --- السيد موسى الثانى --- السيد ابراهيم --- الامام موسي الكاظم --- الامام جعفر الصادق --- الامام محمد الباقر --- الامام زين العبادين --- الامام حسين بن على --- الامام على بن ابى طالب .

(صدام) بەجۆرێك مامەڵەی خۆی لەجێی فیرعەون بالآتر دەبینیەوە. کە (٩٨) ناوی بۆخۆی دانا بوو تەنها یەك ناوی لە ناوەکانی خوای پەروەردگار کەمتر بوو بریتین لە ((صدام) حسین القائد العظم، (صدام) حسين القائد التاريخى (صدام) حسين القائد المنقذ، القائد الرمز،القائد الملهم، القائد العظيم، القائد الضرورة، القائد المنتصر، القائد الأمين، القائد المنصور، القائد الشجاع، القائد المفكر، القائد المبدع، القائد الحكيم، المعلم و القدوه ، حبيب الشعب ، ضمير الامة، ابو العراقيين، فارس الامة، حبيب العراقيين، رجل التأريخ، عز العرب، خيمة العراقين، فخر العراقيين، مهندس التأميم، ملهم الابداع، راعى الطفولة، رائد الديمقراطية، راعي الثقافة، المحرر الباني، رجل الأنتصارات، راعي الأبداع، هدية الله للعراق، رجل العدالة الأول، قائد العراق الموهب، بانى العراق الجديد، بطل النصر والسلام، رمز شموخ العراقيين، قائد النصر والتحرير، قرة عين العراقين، رمز العزة والكرامة، قائد النصر والبناء هبة

البعث للعراق، هبة العراق للامة، عمق التأريخ العربي ، مهندس الأنتصارات العظيمة، رمز الرجولة والشجاعة، ضمانة النصر والتقدم، قائد المسيرة الظاخرة، صانع المجد العربي، محرر الفاو وبانيها،رجل الديمقراطية الأول، رجل المجد والتأريخ، ابه العراق الفذ، صامى البصره وبانيها، النخوة والعزو التحدي، هبة السماء في الزمن الصعب، قائد الجميع وصبيب الشكل، رمز العراق وباني مجده، خير قائد وأعظم بطل، خلاصة عبقرية الأمة، رباب سفينة النصر، ذخر العراق والأمة العربية، هبة السماء إلى هذه الأمة، قائد النادر بين القيادة، قائد نحو العز والمجد، رمز الشموخ والعز والكرامة، العبقرية الفذة والفكر النير، حامل لواء نهضة الفكر، الزهو العربي في زمن الخلود، قائد الثورة وانجازاتها العظيمة، قائد الأمة وبانى مجدها التليد، فارس الأمة وحامل لواء النصر، بطل النصر ورمزه وصانعه، ابن القيم و المباديء العربية، الحلم المنسود للعراق والعراقيين، ابن الشعب البارء ، رائد المسيرة وعز العراقن العقيدة الملخصة والوطنية الشريفة، الرمذي الذي يمثل طموحات، العراقيين، بطل الشعب وقائد معركة النضالية، قائد التنمية والتطوير الأقتصادي، مضخرة قومية لأمة العرب، الأشعاع الخالد في الضمائر والنفوس، رمز العقل العربي الحديث، قمة الانسجام بين العبقرية والقيادة، الشخصية الحضارية للانسان العربي، النموذج الامثل للعلاقة بين القائد والشعب، رمز السيادة والكرامة الوطنية، قائد الحياة في عراقنا الناهض، الوفاء والمهيب للشهداء، رب الاسرة العراقية)– الاسماء الخالدة للرئيس القائد (صدام) حسين– ئەم ناوانەی لە ڕۆژنامەی (العراق) دا بەڕەنگی ملەوەن بلاوكرايەوە و لە (١٩٩٠/١/١١) بەمۆڵەتی وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن بە چوار هەنگاو ڕەنگی چاپ

کرایەوە و دانەی بە (٢) دینار دەفرۆشرا، شاعیرێکی بەکرێ گیراویش (شفیق الکمالی) بە (صدام)ی کافرو بێ دین و زاڵم دەڵێ (تبارك وجهك الوضاء فيينا .... كوجه الله ينضح بالجلال)

(صدام) دەربارەی ئیسلام ئەڵێ (الفقه الاسلامی فقه رجعي، متحجرٌ وجامدُ لايتوافق مع متطلبات العصر، نحن لانتسخ ، ولانستنسخ من الماضی، نحن لانريدُ من الدولة ، او الحزب ان يطبق التعاليم الدينية في دائرته لان ذلك يؤدی إلى التفرقة ، وبذلك نسخر شعبنا، ونريدُ من رجل الدين ان لايتدخل في شؤون الدولة) واتە : (صدام)ی تاغوت پێی وایە شەرعی خوای گەورە، بە کەڵکی ژیانی ئەم سەردەمە نایەت، وە ئەڵێ ئەگەر بەدوای ئیسلام بکەوین خەڵکمان لە کیس دەچێ.

(ئیلیاس فەرەح)یش کە بەرنامەدانەری پەروەردەیی ماسۆنیەتی جیهانی و یەکێکە لە دامەزرێنەرانی بەعس دەڵێ ( إن نظرة حزب البعث للحياة وللدولة، هي نظرة علمانية لا تؤمن بالفكر الغيبی) واتە لە سەربنەمای فیکری مادیەت دامەزراون و بڕوای ڕەهایان بە غەیب و ئایدیا لیزم نی‌یە،

(شبلي العيسمی) کە ئەویش لە گەورە پیاوانی ماسۆنیەتە و بەرنامەدانەری ڕامیاری بەعسە ئەڵێ (وراح رجال الدين المتعصبون يعتبرون الدين هو البديل المنشود و مادام هؤلاء يرون في الاسلام ديناو دنيا وفيه العلاج الشافي والكافي لكل ماتعانيه الامة من امراض و مشكلات في شتى ميادين الحياة، فقد اخذوا يبشرون الناس باقامة الدولة على اساس الاسلام وتعاليمه ؟!)

حیزبی بەعس بەعەمەلی فیکرێکی عەلمانی بوو، وەك (ناجی علوش) ئەڵێ (إنه البعثيين مؤمنون بفصل الدين عن الدولة التي يجب ان تكون علمانية) واتە بەعسیەکان بڕوایان بە جیابونەوەی دین هەیە لە دەوڵەت.

(صدام) وەك کەسێکی خوێنڕێژی دیکتاتۆر دیراسەی مێژووی سیاسەت و ژیانی زۆرێك لە دیکتاتۆرەکانی جیهانی کردووە بەتایبەت سەرکردە ڕوسی و صینی و ئەوروپیەکان ، بە نمونە (هتلر، موسولونی، ستالین، ناپلیون ....) دەبینرا زۆر جار لەوتارەکانیدا قسەی ئەو سەرکردانەی دوبارە دەکردەوە ، لە کۆنگرەیەکی کشتوکاڵیدا ووتی : ( الكرامة الوطنية اغلى من رغيف الخبز ) کە ئەمە قسەیەکی سەرکردەی سینی ( ماوسی تونغ )ە کاتێك دەستی بە شۆڕشی ڕۆشنیبری کرد لە (صین)دا چونکە گەلی صینی هەر چاویان لەنان بوو، یان دروشمی ( من لاينتج لايأكل )ی دەوتەوە ئەمەش دروشمێکی هەڵەیە بەلای ئابوری ناسانەوە، لە کۆلیجی کارگێڕی ئابوری زانکۆی بغداد مامۆستایەك ڕەخنەی لەم قسەیە گرتووە و پێی هەڵەبووە، (صدام) ڕاپێچی زیندانی کرد.

ئەگەر تەماشای ووتارەکانی (صدام) بکرێت هەڵەی زۆر زەق و ئاشکرای تێدایە، یەك جار لە تەلەفزیۆنی ئەمریکی لەڕێگەی (باربراوا لتر) ەوە چاو پێکەوتنی لەگەڵ کرا (باربرا) دواتر هەستی بە هەموو ئەو بێ توانایی و بێ زانیاری و ئەو کەسایەتیە بێ سلوك و دیکتاتۆرەی (صدام) کرد.

بۆیە (صدام) هەمیشە خۆی دەدزێتەوە لە چاوپێکەوتن و کۆ بونەوەی نێو دەوڵەتی، نەك کە ئابڵوقەی لەسەربووەو مامەڵەی لەگەڵدا نەکراوە بەڵکو لە کاتێکیش دا کە دۆخی عێراق بەو جۆرە نەبووە .

(صدام) هیچ کات نەچۆتە ولآتانی ترو سەردانی سەرۆك و وولآتان بکات یان بە شداری لە کۆنگرە عەرەبی وجیهانیەکانیدا بکات، لەڕوی ئەمنیشەوە جورئەت ناکا بەو شێوە دوربکەوێتەوە و دەربکەوێت ، لەیەکێك لە کۆنگرە بالآکانی عەرەبدا بەشداری کرد کە سەرکردە فەلەستینیەکان کۆبوبونەوە بۆ قسەکردن لەسەر بارودۆخی خۆیان و ئیسرائیل و هەڵویستی ولآتانی عەرەبی، دوای گفتوگۆو موناقەشە . سەرۆکی فەلەستینی ووتی گویم لە هەڵویستی عێراق نەبوو، چونکە (صدام) بە جۆرێ قسەی کرد کەس لێی تێ نەگەیشت و نەشیدەزانی قسە بکات، کە سەرۆکی فەلەستینی چەند پرسیارێکی ئاراستەی کرد لەپاش تەواو بونیکۆنگرەکە گوایە هەڵویستی (صدام) چیيە لەسەری چونکە گوێی لە هەڵویستی (صدام) نەبووە لەناو کۆنگرەکان (صدام) زۆر پێی ناخۆش بوو، پاش گەڕانەوەی بۆ بغداد بڕیاریدا حەملەیەکی تیرۆر کردنی ئەندامانی (منظمة التحریر الفلسطینیة) دەست پێ بکات، ئەوەبوو (سعید صماص و عزالدین قلق) و چەندکەسێکی تری تیرۆر کردن.

بۆ ولآتانی ڕۆژئاوا هەر ڕوی تێ نەکردون بۆ سەفەر و بەشداری لە کۆنگرە جیهانیەکاندا، ڕازی نەدەبوو سەرۆکی دەوڵەتانی ڕۆژ ئاوا و هەندێ لەولآتانی عەرەبی سەردانی بکەن ، بێجگە لەهەندێ لەسەرۆك دەوڵەتی داماوی هەژاری ولآتانی ئەفریقای باشور نەبێت .

لەکۆبونەوە حیزبیەکانیخۆشیان دا، سەرەتا کات و شوێنی کۆبونەوەکە دیاری ناکات تا چەند دەقەیەك پێش کۆبونەوەکە ، پاشان ڕێگا نادات ئەندامان هەریەکەو بەتەنها یان بەویستی خۆی بێت بۆ کۆبونەوەکە بەڵکو بەسەیارەی تایبەت هەموویان کۆدەکرێنەوە و دەبران

بۆ شوێنی کۆبونەوە، سەرەتای قسەکردن بە نوکتەیەك یان قسەیەك دەستی پێ دەکرد کە ترس و هەڕەشە بێت بۆیان. لەیەکێك لە جەلسەکاندا بەم چیرۆکە دەستی پێکرد : بازنەیەکی حیزبی بەعس کەلە دوو ئەندام و بەرپرسێك پێکها تبوون بەناوی عبدالحسین و عماد، هەموو کات عبدالحسین پرسیاری دەکرد تەماتە و دۆشاوو ڕۆن لەبازاڕدا نەماوە بەرپرسەکەش وەلامی دەدایەوە، ئەوە فەرمانی سەرۆکە، لەجەلسەی دووەمدا عبدالحسین هەمان پرسیاری دەکردەوە، تاعبدالحسین لەلایەن موخابەراتەوە لەناوبرا !

(صدام) کەسێتی‌یەکی نەخۆشە وەك دکتور (عادل صادق) مامۆستای بەشی پزیشکی (دەرونی و مێشك) لەزانکۆی (عین الشمس) دەڵێ : ( بەبڕوای من شەخصیەتی (صدام) وەك شەخصیەتی چەندین کەسی ترواپە کەلە مێژودا هەن، وەك (مۆسۆلۆنی، هیتلەر، ناپلیۆن ... کەئەمان هەموو دوچاری نەخۆشیەکی دەرونی‌بوون کەپێی دەوترێت (البارانویا) کەمانای (گەورەیی و چەوساندنەوە و دوژمن کاری ) دەدات ، هەندێ جار نەخۆش هەستێکی زۆر گەورە لەدەرونیدا پەیدا دەبێت، وە باوەڕ بەهەندێ شت پەیدادەکات کەپەیوەندی بەڕابردوی مێژوویی خۆیەوە هەیە و ئەیگەیەنێتە ڕادەی تێگەیشتنێکی زۆر هەڵە، باوەڕی وا ئەبێت کە گوایە بەرنامەیەکی پێیە بۆ مرۆڤی سەرزەوی، یان مرۆڤێکی زۆر هەڵکەوتوە یان هەست بەناتوانابیەك ئەکات لەدەرونیدا جاهەستی لاوازی پیاوانەی بێ یان بێ‌نرخی بێت لای خێزانەکەی، وای لێ دەکات، کە(صدام) لەمانەش زیاترە، هیتلەر بێ توانایی جنسی کەموکوڕییەکەی بوو ، ناپلیۆن بالا کورتی .

## پەیوەندی جمال عبدالناصر و صدام

صدام زیاتر لە سێ ساڵ لەولاّتی میصر ماوەتەوە لە تەمەنی (٢٣) ساڵی دا ، صدام دوای ئەوەی چووە قاهیرە دەستی کرد بە خوێندن و نامەیەکی بۆ مامی نارد داوای ژنی ەکرد چونکەدەستنیشانی ساجیدەی خاڵی کردبوو ، خیرالله زۆری پێ خۆش بوو بەلاّم وتی کاتێك صدام گەڕایەوە عێراق ئەوکاتە ئەتوانێت ساجیدە بگوازێتەوە ، زوو زوو موخابەراتی میصری ژورەکەی صدام و چەند هاوڕێیەکیان دەپشکنی لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکردن ناچار بوون پەیوەندی بکەن بە (جمال عبدالناصر)ەوە ئەو کەسانەش کەلەگەڵ صدام بوون بریتی بوون لە ( کریم الشیخلي، حاتم الفداوي، طه یاسین علي ، مدحت ابراهیم جمعة ) ئەوبوو دوای ئەو پەیوەندی کردنە بە ناصرەوە باوردۆخی ژیانیان باش بوو ، چونکە پەیوەندی جمال و عبدالکریم قاسم خراپ بوو لەوکاتەدا بەلاّم کەسێکی زۆر خراپ و داوێن پیس بوو تەنانەت لە شوباتی ١٩٦٣ دا لە میسر دەریان کرد لەسەر مەسەلەی ئافرەت ، خاوەنی چایخانەی (ئەندیانا) بەناوی (حسین عبدالمجید) دەڵێت ئێستەش صدام نزیکەی چەند سەد دۆلارێك قەرزارەو شتی دەخوارد پارەی نەئەدا .

کتێبێك دوای مردنی جمال عبدالناصری سەرۆکی میسری بلاّوکرایەوە لەلایەن (فەتحی دیب)ەوە بەناونیشانی (الـ ٣١ ضوء على محاولة اغتيال عبدالناصر ) واتە (٣١ تیشك بۆ سەر هەوڵی تیرۆر کردنی عبدالناصر) کە صدام نەخشەی بۆ کێشاوە ، بۆ یەکەمجار بوو ئەم کتێبە بلاّو بکرێتەوە، باس لەوەو دەکات کە صدام چۆن لەڕێگای ئەو بەعسیانەوە لە میسر دەیانخوێند نەخشەی کوشتنی جمال عبدالناصری کێشساوە و کاری بۆ کراوە تا فەتحی دیب توانیویەتی پیلانەکە ئاشکرا

بكات و تەواوی ڕێکخستنە نهێنیەکەی بەعس لە میسر دەستگیر کران ، ئەم نهێنیە لای (فتحی دیب) مایەوەو ئاشکرای نەکرد تا (٣١) ساڵ دوای مردنی عبدالناصر . ناصر نامەیەکی پێگەیشتبوو لە سەفیری خۆیانەوە (لطفي متولي) لە بغداد کە داوای کردبوو ئەو کەسانە بخرێنە بەر لێبووردن ، ناصریش لەوەلاّم دا نوسیبوی منیش وای دەبینم دوربخرێنەوە بۆ عێراق بەبێ دادگایی کردن .

صدام تەواوی تەمەنی بریتی بووە لە پیلان بەرامبەر تەنانەت ئەو کەسانەش کە هاوکاری بوون و پشتیوانیان کردووە لە ڕۆژە میحنەتەکانی تەمەنیا چونکە خاوەنی هیچ سلوکێکی مرۆیی نەبووەو وەفای بۆ خێزانەکەی خۆشی نەبووە .

## گرنگترین نهێنی
## بەرنامەی پرچەك کردنی صدام

صدام لە ساڵی (١٩٧٥)دا لەچاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەوانی دا لەگەڵ ڕۆژنامەنوسێکی لوبنانیدا ووتی : پەیوەندیەکانمان لەگەڵ (فەرەنسا) دا زۆرباشەو یەکەم هەنگاو دەنێین بۆ ئەوەی بتوانین عەرەب بکەین بەخاوەنی چەکی ئەتۆمی !!

سەرەتای ساڵی (١٩٨١) صدام توانی بەبڕی (٣ملیۆن دۆلار) کەرەستەی بەرهەمهێنانی چەکی ئەتۆمی لە فەرەنسا بکڕێت بەو هیوایەی لە تەموزی ئەوساڵەدا کارگەی بەرهەمهێنانی چەکی ئەتۆمی بخاتە کار.

لە (١٩٨١/٦/٧) دا بەهۆی بۆردومانێکی نهێنی هەشت فڕۆکەی (F16)ی ئیسرائیلی کەلە بنکەی ئاسمانی سیناوە هەستابوون ،

توانییان گەورەترین بنکەو کۆگای چەکی ئەتۆمی صدام لە خواروی بەغدا لەناو بەرن کە (٢٦) ڕەتڵ یۆرانیۆمی ئامادەکراوی تێدا بوو لەبەین چوو !

هۆکاری سەرەکی ئەم بۆردومانەش شکستی هەوڵەکانی (ئیسرائیل) بوو لەبەرامبەر (ڕۆناڵد ڕیگان)ی سەرۆکی ئەمریکا بۆ لە ناوبردنی بەرنامەو کارگە ئەتۆمیەکانی عێراق .

لەوکاتەدا (جۆرج بۆش) جێگری سەرۆك و (جیمس بیکر) سەرۆکی ئەرکان بوو ، (بۆش) باوەڕی وابوو دەبێت ئیسرائیل سزا بدرێت لەسەر ئەو بۆردومانە بۆیە دوای چەند ڕۆژێك لە کۆبونەوەکەی ڕیگان و دارو دەستەکەی، دەرکەوت کە (جین کیرکباتریك)باڵوێزی (ئەمریکا) لە نەتەوە یەککگرتووەکان بە نهێنی هاوکاری لەگەڵ (سعدون حمادی) وەزیری دەرەوەی عێراق و باڵوێزی عێراق لە نەتەوە یەککگرتووەکان و(صالح عمر العلی) کردووە بۆ داڕشتنی بڕیارێك بۆ تاوانبار کردنی ئیسرائیل ، ئەوەبوو لە (١٩٨١/٦/١٩)دا ئەو بڕیارە ئیمزا کرا.

هەرچەندە لە جەنگی عەرەب ئیسرائیل دا نێوانی عێراق و ئەمریکا خراپ بوو بەلاّم لە شەڕی دژی ئێران دا دیبلۆمات و دەسەلاّتدارو بڕیار بەدەستەکانی کڕینی چەك بۆ عێراق چەندەها داواکارییان بەرز کردەوە بۆ پینتاگۆن و پارتی کۆماری و چەندەها کەسایەتی ئەمریکی پەیوەندیدار بە سیاسەتەوە ، بە مەبەستی یارمەتی دانی عێراق لەو جەنگەدا بەتایبەتی پاش ئەوەی سەرۆك ڕیگان دەسەلاّتی گرتە دەست ، بۆ ئەو مەبەستە کۆمەڵێك چاودێری سەربازی ئەمریکی ڕەوانەی عێراق کران .

( هیگ ) چەندجارێك ئەوەی دوپات کردەوە کە (ئەمریکا) بە هیچ جۆرێك یارمەتی عێراقی نەداوە ، بەڵام کاتێکی درەنگ لە ساڵی (١٩٨٣)دا کە کابینەی ڕیگان دەستی لە کار کێشایەوە ، زۆر تورە بوو لەوەی کە زانی کەمێك یارمەتی نهێنی بە عێراق دراوە لە ڕێگەی (ولیەم کیسی) سەرۆکی (ئیستخباراتی مەرکەزی ئەمریکا -CIA) لەپشتی ئەوەوە ، هەرچەندە وەزارەتی دەرەوەی (ئەمریکا) ساڵی (١٩٧٩) لەیەکەم ساڵی هاتنە سەر حوکمی (صدام) دا ، ئەمریکا عێراقی لە لیستی ئەو وڵاتانەدا دانابوو کە پشتگیری ئیرهاب دەکەن .

لەساڵی (١٩٨١) دا ئەفسەرێکی پلەداری عێراق بەناوی (ابوعلی) گەیشتە نیۆرك و سەردانی کارگەیەکی کڕینی پۆڵای کرد ، ئەمە لەکاتێك دابوو کە بەگەیشتنی ئەو ئەفسەرە سەرۆکی پۆلیسی نیۆرك بڕیاری دا پۆلیسی زیادە بنێرن بۆ پاراستنی ماڵی سەفیری عێراق ، هەر لەم کاتەدا (ساجیدە)ی ژنی صدام چوبووە نیۆرك بۆ کڕینی جۆرەها جل وبەرگ کە گرنگترینیان نیو دەرزەن ئۆتۆمبیلی دژە نارنجۆك و جلی دژە گوللە و ئامێری تەل دار و بێ تەلی زۆر پێشکەوتوو بوو. گەنجێکی ئەردەنی کە ناوی (فەرەد حەوبەش)بوو لەو کارگەیەدا ئیشی دەکرد ، بەزیرەکی و فێڵبازی خۆی توانی لە ڕێگەی هاوڕێیەکی عێراقی‌یەوە ناوە ڕاستەقینەکەی ئەو ئەفسەرە بدۆزێتەوە ئەویش (حسین کامل) بوو.

بەڵام بە پلەیەکی نزمەوە خۆی دەردەخست ئەویش (ملازم اول)بوو ، ئەو پلە ئەفسەری‌یە نزمەش بۆشاردنەوەی ڕۆڵە ڕاستەقینەکەی بوو ، کە سەرۆکی بەرنامەی صەدامی تایبەت بو بۆ کڕینی چەك و تەکنەلۆژیای ڕۆژئاوایی و کەرەستە و کەل و پەل بۆ پرۆژەی چەکی بایۆلۆژی و

کیمیایی ناوك ، لەسەرو ئەوەشەوە صەدام خەریك بوو بیکاتە سەرکردەی گاردی کۆماری .

ئەو وەرگیرەی لەگەڵ (حسین کامل)دا بوو بەو سیفەتەی نوێنەری (حسین کامل)ە لە نیسانی (١٩٨١)دا بانگهێشتی سەرۆکی کارگەکەی کرد سەردانی بەغداد بکات. (هیکی) سەرۆکیش بڕیاریدا بەزوترین کات سەردانی بەغداد بکات، لەبەر ئەوەی زمانی عەرەبی نەدەزانی بۆیە داوای لە (حەوبەش) کرد لەو سەفەرەیدا هاوڕێیەتی بکات.

سەرەتا (حەوبەش) هەندێك ترس دایگرت، بۆ ئەو کێشانەی دێتە پێشیان هەر لەوەرگرتنی ڤیزەوە تا پاسپۆرت و چوونە ناو عێراقەوە، چونکە ئەو دەمە هیچ پەیوەندییەکی دیبلۆماسی و باڵوێزخانە و تەنانەت قونصلیە و هێڵی ئاسمانی لە نێوان ئەم دوو وڵاتەدا نەبوو. کاتێك یەکەم هەنگا و نرا لە ژیانی تازەو پڕ مەترسی داردا، هەموو ئەو نیشانەی پرسیارانە لە مێشکی (حەوبەش)دا سڕانەوە و بۆی دەرکەوت کە بەربەست و ڤیزە و نەبوونی هێڵی ئاسمانی و دیبلۆماسی هیچ گرنگ نییە لە جیهانی پەیوەندییە نهێنییەکاندا.

سەفەرەکەی (حەوبەش) پڕ بوو لە دوو دڵی، بەڵام (حەوبەش) و هیکی لەگەڵ (حسین کامل) دا کۆبوونەوە، (حەوبەش) بۆی دەرکەوت کە بیرکردنەوەکەی هەڵەیە، چونکە (حسین کامل) ڕاستەوخۆ چووە ناو باسەکەوە و دڵگرانی کۆشکی کۆماری عێراقی دەربڕی بەوە کە ئەو کارگە ئەمریکییە نەیتوانیوە ئەو کەل و پەلانە دابین بکات کە (حسین کامل) داوای کردبوو.

بە هەرحاڵ وا ئێستا لیستێکی تازەی لایە، بە داواکاری تر، کاتێك (حەوبەش) سەیرێکی لیستەکەی کرد ترسێك دایگرت، بایی یەك بلیۆن

دۆلار زیاتر بوو، ئەمە لە لایەك لە لایەکی تریشەوە ئەم ئیشە گرانە بەبێ بەرتیل جێ بەجێ ناکرێت، ئەمەش ملیۆنەها ملیۆن دۆلاری دەویست، چونکە لیستەکە جبە خانەیەکی تەواوی لەخۆ گرتبوو، هەر لە ڕادارەوە تا دەگاتە تانك و زرێ پۆش و فڕۆکە و موشەك و ئەدەواتی یەدەکی، (حەوبەش) لەوە دڵنیا بوو ئەنجام دانی ئەم داواکاریانە بە شێوەیەکی نایاسایی نەبێت جێبەجێ ناکرێت. لەبەر ئەوە عێراق لە لیستی ئەو وڵاتانەدا دانرابوو کە یارمەتی ئیرهاب دەدات، جا بۆیە بەستەمی دەزانی ئەم چەکانەی بگاتێ، سەرەڕای ئەوەش سەرۆك جیمی کارتەر ئابڵوقەی چەك فرۆشتنی خستبووە سەر هەردوو وڵاتی عێراق و ئێران دوای هەڵگیرسانی شەڕ لە نێوانیاندا لە ئەیلولی (١٩٨٠).

(حەوبەش) ئاگای لەو کەین و بەینە نەبوو لە کاتێکدا زاواکەی صەدام داوای لە ئەو و هیکی کرد ئەو چەکە ئەمریکیانەیان بۆ دەست بخەن، (موریس دیبر)ی نێردراوی وەزارەتی دەرەوەی (ئەمریکا) لە سەردانێکی دۆستانەدا بوو بۆ لای (سعدون حمادی)ی وەزیری دەرەوەی عێراق، وەکو دەست پێش خەریەك لە (ئەمریکا)وە بە مەبەستی دەست پێ کردنەوەی دیبلۆماسی لەگەڵ عێراقدا، هەرچەندە ئەو دەست پێشخەریەی ڕیگان لە لایەن عێراق ڕەفز کرا، بەڵام گۆڕانێکی زۆر کەم ڕوویدا، ئەویش بەهۆی زیاد بەلادا شکاندنی کۆشکی سپی بەلای عێراقدا بوو.

وتووێژی نێوان (حەوبەش) و هیکی و (حسین کامل) کەمتر لە یەك کات ژمێری خایاند، تیایدا (حەوبەش) بەدڵتەنگی هاتە دەرەوە، بەڵام هیکی زۆر ئارام و لەسەر خۆ بوو، بۆیە (حەوبەش) هەرچەندی دەکرد ئەم ئارامی و ساردییەی هیکی بۆ نەدەچووە سەر یەك. باشە هیکی

دەتوانێت چی بکات بۆ (حسین کامل)؟ حەوبەش وەڵامی ئەم پرسیارەی دەست نەکەوت تا کاتێکی درەنگ لەو ساڵەدا، هیکی زۆر جاران (حەوبەش)ی دەخستە نێو جیهانی چەکەوە، بەتایبەتی ئەگەر ئیشەکە پێویستی بە کەسێکی عەرەبی زان بوایە یان پەیوەندی بە ڕۆژ هەڵاتی ناوەڕاستەوە هەبوایە. لە پایزدا هاوڕێیەکی هیکی داوای لێ کرد هاوڕێیەتی بکات لەدوو گەشتدا بۆ بەڕازیل بەمەبەستی چەك کڕین بۆ عێراق لە کارگەیەکی (ریۆدی جانیرۆ) کە چەکەکان بریتی بوون لە قازیفەی (٧٥) ملم ی دژە فڕۆکە و قازیفەی مەدفەعی جۆری (١٥٥) ملم و (١٠٥)ملم.

گواستنەوەی ئەم چەکانە بۆ عێراق لە وڵاتێکی (ئەمریکا)ی باشوورەوە گرنگی‌یەکی یاسایی نەبوو، چونکە مەسەلەکە پەیوەندی بە هاوڵاتی‌یەکی ئەمریکی‌یەوە هەبوو، بۆیە (حەوبەش)ی هیچ دوو دڵ نەکرد.

لە کانونی یەکەمی ساڵی (١٩٨١) (حەوبەش) زۆر شت تێ گەیشت لەو شتانەی کە دوو دڵیان کردبوو، ئەو شێوە ڕەفتارانە کە هەندێك لە هاوڕێکانی هیکی کردیان لەگەڵ سیاسەت و یاسا ڕاگەێنراوە ڕەسمی‌یەکانی (ئەمریکا)دا بە تایبەتی لەبارەی فرۆشتنی چەکەوە بە عێراق، (حەوبەش)ی سەرسام کردو تورە بێت و زیندان بۆ خۆی دابنێت. بەڵام هاوڕێکانی هیکی کە هەمویان پەیوەندی چاکیان لەگەڵ لێپرسراوە سەربازیەکانی (ئەمریکا)دا هەبوو، هەوڵیاندا تا لەتازەوە دڵنیای بکەنەوە کە ژمارەیەکی زۆر کەمی بازرگانانی چەك تا ئێستا زیندانی کراون.

(حەوبەش) تا ڕۆژی (٢)ی کانونی یەکەم، هەرگیز بڕوای نەدەکرد ئیشەکە بەو ئاسانی‌یە بەسەریەوە بچێت، تا کاتێك چاوی کەوت بە

(روبـەرت جونســون) و (ریتشــارد سمیــث) نوســینگەکانی پســپۆڕانی جونسون، کە پسپۆڕانی جیهانی بوون لـە چـەك فرۆشتندا لـە بـاکوری ڤیرجینیـا، هـیچ جیاوازیـەکیان نـەبوو لەڕواڵـەت دا لەگـەڵ ئـەو هـەزاران نوسینگەیە کەدەکەونـە (٥) میلـی بەرامبـەر واشـنتۆنەوە لەسـەر روبـاری (بوتماك)، ریتشارد سمیث لێپرسراوی بەشی دامەزراندن و (روبرت جونســون)ی ســەرۆك توانیبویــان لەگــەڵ ئــەو کۆمەڵگەیــەدا خۆیــان بگونجێنن، کەئیشـی حکومی تایبـەتی یان گشتی بوایە تیایدا دەکرا، چـونکە دەوڵــەت هەنـدێك نوسـینگەو فەرمانگـەی هەیـە چـەندەها کـاری نهێنـی تێـدا ئـەنجام دەدرێـت بـەبێ ئـەوەی هـیچ ژمـارە و ناونیشـان و بەڵگەیەکی پێوە بێت. (سمیث و جونسون) لـەو کەسانە بوون کە لەگـەڵ وەکالــەتی موخابــەراتی مەرکــەزی ئــەمریکیدا ئیشــیان دەکــرد، نــەك بەشێوەی ئەندام، بەڵکو وەك ئـەو هـەزارەها کەسە کەپـەیمانیان دەبەست لەگەڵیان بۆ جێبەجێ کردنی هەندێك کار، بەشێوەی شەخصی یان لـە ڕێگەی کارگە تایبەتییەکانـەوە و زۆر کـەم خـاوەنی ئـەم کارگانـە ڕاستی ماهیەتی ئەو ئیشانەیان دەزانی کەجێ بەجێیان دەکرد.

لەکانوونی دووەم، ماوەیەکی زۆر نەبوو بەسەر ڕێکـەوتنی (صـفقە)ی ریـۆدا تێدەپـەڕی (حـەوبـەش) وهیکـی سـەرکەوتن بـۆ نهـۆمی چـوارەم لـە کارگـەی پسپۆڕانی جۆنسـۆنو لـەماوەی دانیشـتنەکەدا سمیـث هـەر بـێ دەنگ بوو، ئـەو کەسـەی کـە هیکـی هـاتبوو ببینێـت (روبرت جونسون) بوو، جونسون هـەڵس و کـەوتی وای پیشـان دەدا کـە پیـاوێکی سوپایی بێت، بەڵام قسـەکانی پیشـانی دا کەفەرمانبـەرێکی دەوڵەتـە، لـە ڕاستیدا هەرکـەس تەماشـای بکردایـە بـە پیـاوێکی ئیسـتخبارات دەیخوێنـدەوە. چونکە لە کاتی پێویستدا نەبوایە نەدەدوا، ئەوەیش پاش ماوەیـەکی بـێ

دەنگــی زۆر جۆنســۆن هــاوڕێی زۆری هــەبوون لــە پــەنتاگۆن و سـەرکردایەتی هاوبەشـی کـرداره تایبەتی‌یـەکانی (JSOC) (القیـادة المشـترکة للعملیـات الخاصـة) هـەروەها پەیوەندیـەکی باشیشـی هـەبوو لەگەڵ چەك فرۆشە سەربازی‌یەکاندا و نوێنەری چەندەها کارگـە بـووە کـە پڵیتەی قومبەلە و بەشەکانی مەدفەع و کەرەستەی تـریتن بەرهـەم دەهێنا و دەیفرۆشتە بازرگانـانی چـەك، هـەروەها فەرمانبـەران لـە پـەنتا گـۆن و بەکرێ گیراوانـی ئیسـتخبارات ڕایانگەیانـد کـە جۆنسـۆن پەیوەندی‌یـەکی زۆر باشی لەگـەڵ (روبـرت گیـتس)ی سـەرۆکی (CIA)دا هـەبووە، شـەڕی عێراق – ئێران بوو بەهۆی دەوڵەمەنـد بـوونی زۆر کـەس لـە زۆر وڵاتـدا، لــەو وڵاتانــە ڕێژەیــەکی زۆر کــەمیان نــەبێت ملکەچــی بڕیارەکــانی ئەنجوومەنی ئاسایشـی نێودەوڵـەتی نـەبوون، کـە بـەتێکڕای دەنـگ داوای لە هەموو وڵاتانی جیهان دەکرد پابەندی تەواوی نەفرۆشتنی چەك بن بە هیچ وڵاتێکیان کە ببێتە هۆی زیاتر خۆش کردنی شەڕەکە.

یاسا لە وڵاتـە یەککگرتووەکانـدا دەیگـوت: بـە بـێ ڕەزامەنـدی ڕەسـمی دەوڵـەت چـەك نانێردرێـت بـۆ عێـراق، بۆیـە (حەوبـەش) بـاوەڕی نـەدەکرد بەوەی کـە لـە ڤێرجینیـا ڕووی‌دا، کاتێـك جۆنسـۆن لەسـەر کورسـی‌یەکی دانیشتبوو سەیری لیستی چەکە یەك بلیۆن دۆلاریەکەی (حسین کامل)ی دەکرد، وتـی: هیچ کێشە نی‌یە.

لـە مانگـەکانی دوایـی دا (حەوبـەش) درێـژەی بـە کۆبوونـەوەکانی‌دا لەگـەڵ (جۆنسـۆن) و (سمیـث)دا لـە سـەرەتای سـاڵی (١٩٨٣)، هـەردوو هاوڕێکەی گومانی ئەوەیان لێکرد، هاوڕێکەیان هەواڵنێرێکی ڕۆژنامەیە، زیاتر لە هاوڕێیەك، چونکە بەزمانی عـەرەبی دەدوێـت و زۆر شـت لەمـەڕ ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت دەزانێـت، هـەروەها لەدوایشـدا زیـاتر لەگەڵیـدا

تێکەڵ و نەرم و نیان بوون، پێیان گەیاند کە هەردووکیان دوو بەکرێ گیراوی کۆنی (CIA)ن، هەروەها ناساندنیشیان بە پارێزەرەکەیان، کەئەویش پیاوێکی کۆنی ئیستخبارات بوو، یەکێك بوو لەوانەی ماوەیەکی زۆر کاری لەو ئیشە تایبەتیانەدا کردبوو کە لەپشتی دەرگا داخراوەکانەوە ئەنجام درابوو لە فەرمانگەکانی دەوڵەتدا.

ئەوەی سەرنجی (حەوبەش)ی ڕاکێشا لەو پارێزەرەدا ئەوە بوو هەمیشەپێیان دەوت لە شوێنی وشەی عێراق وشەی ئوردون بەکار بهێنن.

لە بارەی چۆنیەتی ناردنی ئەو چەکانە بۆ عێراق، یەك کێشە کە ڕوو بەڕوویان بوویەوە، دەست خستنی کارتی موزەوەر بوو بۆ داپۆشینیچەکەکان، ئوردونیش چاکترین شوێن بوو بۆ پەیدا کردنی ئەو کارتە تەزویرانە.

لەبەر ئەوەی خێزانی حەوبەش نیشتەجێی ئوردون بوون، بە بەردەوامی داوای لێ دەکرا پاڵەپەستۆ بخاتە سەر هەرکەسێك لە ئوردون کە دەیناسێت، تا یارمەتی بدات بۆ بەرەو پێش بردنی کارەکە.

بەهاتنی ساڵی (١٩٨٢) هێزە سەربازییەکانی ئوردون دەستیان کرد بەگواستنەوەی کۆپتەرە ئەمریکییەکان بۆ عێراق. هەرچەندە یاساکانی ناردنی ئەمەریکی بەڕوونی قەدەغەی ئەوەی دەکرد کە نابێت لایەنی سێیەم چەکەکانی (ئەمریکا) بە بێ ڕەزامەندی واشنتۆن بگوێزێتەوە بۆ عێراق، بەڵام باوەڕی حکومەتی ڕێگان وابوو کە عێراق زۆر پێویستی بە یارمەتییە، بۆیە لە بەرامبەر ئەم کارەدا چاوی قونجان.

لە بەهاری ساڵی (١٩٨٢)دا کاتێك حەوبەش خۆی دیتەوە لەگەڵ جونسۆن و سمیثدا واتێ کەوتووە ناتوانێت بگەڕێتەوە بۆ خاڵی

سەرەتا، بۆیە وازی لەو کارگە ئەمریکی‌یە هێنا و دەستی کرد بە ئیشێکی بێ لایەن لەگەڵ بەڕێوبەرە کۆنەکەیدا و لەگەڵ کارگەی پسپۆڕی جۆنسون بە ناچاری ڕەزامەندی دەربڕی لەو باردۆخەدا جارێکی تر سەفەری بەغدا بکات و بە کاربەدەستانی عێراق ڕابگەیەنێت ئەو چەکانەی داوایان کردوە، خەریکە بە تەواوی دابین بکرێت، بۆیە ئەمجارەش لە تازەوە لە سەرەتای نیساندا حەوبەش خۆی لە ئوتێلی منصور میلیا دیتەوە. کاریگەری شەڕی عێراق – ئێران زیاتر بەدیار کەوتبوو بۆ حەوبەش لە چاو ساڵی پاردا، حەوبەش لە شەوێکی درەنگدا کاتێك خەریکی نان خواردن بوو لە چێشتخانەی ئوتێلەکە، چاوی بە ژمارەیەکی زۆر ئەفسەری سەربازی کەوت، کە خەڵکیان دانابوو لە دەوری مێزێك و لە وڵاتە جیاجیاکانی ڕۆژئاواوە هاتبوون، کەواتە ئەو پیاوانە چاودێری سەربازین، بۆیە هاتبوونە بەغدا تا صەفەقاتی چەك فرۆشتن لەگەڵ عێراقدا تەواو بکەن ، لەگەڵ ئەوەشدا وڵاتەکانیان وایانپیشان دەدا کە زۆر پابەندی بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانن لەمەڕ جەنگی عێراق – ئێران.

حەوبەش کاتێك هاتە بەغداد دوای سێ ڕۆژ ئنجا توانی چاوی بە حسین کامل بکەوێت، کامل زۆر بەگەرمی پێشوازی کرد و زۆر بەخێری هێنا و داوای لێبوردنی لێکرد لەو دواکەوتنە، ئینجا عبدالجبار شنشل سەرۆکی ئەرکانی سوپای پێ ناساند و دوای ئەوە بە هەرسێکیان چوون بۆ نووسینگەی حسین کامل لە کۆمەڵگای سەرۆکایەتی، لەو چاوپێکەوتنەدا کە نزیکەی دوو سەعاتی خایاند حەوبەش بە درێژی هەموو ئەو هەواڵە خۆشانەی گەیاندە گوێی حسین کامل و شنشل و ڕوونی کردەوە کە دوای ساڵێکی تر ئەو پێداویستیانەی عێراق داوای

کـردووه دابـین دەکرێـت بـە هاوکـاری بەڵێنـدەرە نـا حکـومی و بـەکرێ گیراوەکـانی کـۆنی (CIA) و پـاش ڕەزامەنـدی کاربەدەسـتانی ئـوردونی ئەو چەکانە یەکسەر لە ڕێگەی ئوردونەوە دەنێرێتە بەغداد.

دوای ئــەوە هەرســێکیان قــاوەی تورکی‌یــان خــواردەوە، حەوبــەش ئامادەی ڕۆیشتن بوو، بەڵام حسین کامل کێشایە لاوە و ئاگاداری کردەوە کە سەرۆك (صدام) حەز دەکات چاوی پێ بکەوێت. هـەردووکیان کـەوتنـە ڕێ بـۆ کۆشـکی کـۆماری، دوو ژووریـان تێپەڕانـد تـا گـەیشتنە ژوورێکـی زۆر گــەورە، (صــدام) لــەو ژوورەدا لــە پشــتی میزێکــی دارینــی ڕەشــدا دانیشتبوو. (صدام) هەرکە چاوی بە حەوبەش کەوت، یەکسـەر هەسـتایە سەرپێ و بەرەو لای هات و سڵاوی لێکرد و زۆر سوپاسی کرد بۆ ئـەوەی کــە کردوویــەتی بــۆ بەرژەوەنـدی عێـراق، ئینجـا ئیشـارەتی بەیـەکێك لــە پاســەوانەکانی دا، ئــەویش هاتــە لای حەوبەشــەوە جانتایــەکی بچــووکی سویدی پێشکەش کرد، چاوپێکەوتنەکە سێ دەقیقە زیـاتری نەخـایـانـد، کاتێــك حەوبــەش گەڕایــەوە ئوتێلەکــە جانتاکــەی کــردەوە دەبینێــت کاتژمێرێکی زنجیر ئاڵتوونی خالیسە و ناوەکەشی وێنەیەکی (صدام)ە و تەنها سەروشـانی دیـارە ، کاتێـك حەوبـەش گەڕایـەوە (ئـەمریکا) هـەرچی ڕووی دابــوو هــەمووی بــۆ (جونســون و سمیــث) بــە ووردی گێڕایــەوە، ئـەوانیش دڵنیایـان کـرد هـەموو شتێك بە باشـی دەڕوات بـەڕێوە، دوای ئـەوەش دووجـاری تـر ناردیانـەوە بەغداد، کاتێـك حەوبـەش نـاڕەزایی لـە فەرمانبەرانی گومرگی نیۆرك دەربڕی کە لێکۆڵینـەوەیان لەگـەڵ کـردووە لەسـەر ئـەو هـەموو مـۆرەی لـە فرۆکەخانـەی عـەممان لـە پاسپۆرتەکەی دراوە، جونسون زۆر بەئاسـانی لەگـەڵ فەرمانبـەرانی گومرگـدا بـە دەسـت تێوەردانێکی بچووك کێشەکەی چارەسەر کرد ، هەموو جارێك حەوبـەش

پرسیاری چۆنیەتی دابین کردنی پارەی سەفەری چوون و هاتنەوەی بەغدادی لە (جونسون) دەکرد ، بەلأم جونسون بێ دەنگ دەبوو، حەوبەش هەر سوور بوو لەسەر ئەوەی بزانێت ئەو پارەیە لە کوێوە دابین دەکرێت ، بۆیە جۆنسۆن لە وەلأمێکی زۆر ئالۆزدا دەستی بۆ کۆشکی سپی و CIA ڕاکێشا بێ ئەوەی ناوی هیچ کامیان بێنێت ، بەلأم حەوبەش هەر سوور بوو لەسەر پرسیارەکانی بۆیە جونسون ناوی (ولیام کیسی) سەرۆکی ئیستخبارات و جێگرەکەی (روبرت گیتس) و (ولیام کلارك) ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی بۆ درکاند ، کە لە جێبەجێ کردنی ئیشەکەیدا یارمەتی دەدەن.

کاتێك مکفرلین کرایە جێگری ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی (هواد تیکر)ی هەڵبژارد وەك یاریدەدەری کە شارەزابێت لەکاروباری ڕۆژهەلأتی ناوەڕاست دا .

(هواد تیکر) بە ماوەیەکی کەم دوای ئەوە بوویە کەسایەتیەکی سەرەکی لە کۆشکی سپیدا، ئەرکی چاودێری صەفقەی چەکە ڕۆیشتووە کانی دەکرد بۆ ڕۆژهەلأتی ناوەڕاست ، تیکر خوێندنی بالأی دیراساتی دەولی بالأی تەواو کردبوو. کە لقێك بوو لە زانکۆی (جونز هوبکین)ی نموونەیی و قوتابیەکانی ناویان لێ نابوو قوتابخانەی مەشقی (CIA).

تیکر هەر لە سەرەتای دەست بەکار بوونیەوە گرنگیەکی تایبەتی دابوو بە (صدام) ئەو کاتەی وەکو لێکۆڵەرێك لە نوسینگەی وەزیری بەرگریدا ئیشی دەکرد ساڵی (١٩٧٩) توێژینەوەیەکی بە پەنجا لاپەڕە نوسی تیایدا پێشبینی ئەوەی کردبوو کە (صدام) سنوری ئێران دەبەزێنێت بەمەبەستی داگیر کردنی هەندێك لە ناوچە دەوڵەمەندە

نەوتی‌یەکانی ئێران، دوای ئەوەی لە ئێران ڕزگاری بوو داوای گەڕانەوەی کوەیت دەکات بۆ عێراق ، تیکر هێندە کەیفی بە (صدام) دەهات تەنانەت هاوڕێکانی ناویان لێ نابوو (تیکر تکریتی) .

(هارلود براون) وەزیری بەرگری لە سەردەمی جیمی کارتەردا گوێی نەدایە ئەو ئاگادار کردنەوە ترسناکەی تیکر و لە پەراوێزی توێژینەوەکەدا نووسی (لێی ڕازی نیم، عێراق گۆڕاوە و ڕەوشتی ڕاست بووەتەوە).

لە ماوەی سالآنی (١٩٨٢ – ١٩٨٣)دا تیکر هەندێك ئیشی چاو پێ کەوت لە کاتی چاودێری کردنی کاروانە چەکەکان بۆ ڕۆژهەلآتی ناوەڕاست.

ماوە ماوە هەندێك بروسکە دەکەوتنە دەستی باسی ئەوەیان دەکرد ئەو چەکە ئەمەریکی‌یانە دەنێررێنە ڕۆژهەلآتی ناوەڕاست، دەگەنە عێراق. هەستی کرد ئەم چەك ناردنە بۆ عێراق نایاسایی‌یە، هەروەها هاوڕێکانی چەند شتێکیان پێ ڕاگەیاند کە سەرسامی کرد، وەکو ناردنی کەل و پەلی سەربازیی ئەمریکی بۆ عێراق، بە فەرمانی ڕاستەو خۆی کۆشکی سپی و لەوانە چەك و مەوادی یەدەکی و ئامێری بەرگری ئەلکترۆنی و کۆمپیوتەر، کاتێك تیکر دەستی کرد بە لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو مەسەلەیە و تووشی (صەدمە) بوو لەو وەلآمە نامۆ و بەرق ئاسایانەی کە دەیبیست تەنانەت ئەوەیشی پێ وترا کە فڕۆکە بارهەڵگرەکانی چەکە نهێنی‌یەکان بە مۆڵەتی فەرمانبەرانی کۆشکی سپی دەفڕن.

پاشان ئەوەشی زانی کە کۆشکی سپی خۆی پەنای دەبردە بەر هەندێك کەناڵی دیاری کراو بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو سیاسەتانەی،

کاتێك پرسیاری لە هاوڕێکانی کرد دەربارەی چۆنیەتی گواستنەوەی ئەو کەل و پەلانە بۆ عێراق؟

پێیان وت: کەسانێك هەن لە دەرەوەی حکومەتدا ئەو ئیشە ئەنجام دەدەن، لەبەر ئەوەی تیکر زۆر کەللە ڕەق بوو تەنانەت پرسیاری لە ناوی ئەو کەسانەش کرد کە لە دەرەوەی حکومەت ئەو ئیشە ئەنجام دەدەن، بۆیە ناوی روبرت جونسون و ریتشارد سمیثی بۆ برا لە یەکێك لە کۆبوونەوەکانی کۆشکی سپی‌دا کە تیکر ئامادەی بوو، بۆش زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی یارمەتی عێراق زۆر بدرێت، بۆیە دەرگاشی هەمیشە کراوە بوو لە رووی عێراقی‌یەکاندا بەبێ هیچ مەرجێك، ئەگەر کەسێکیان بیویستایە چاوی پێ بکەوتایە.

کیسی زۆر پێ‌ی لەسەر ئەوە دادەگرت دەبێت بە نهێنی یارمەتی عێراق بدرێت و ناویشی لە لیستی وڵاتە ئیرهابی‌یەکاندا ڕەش بکرێتەوە، چونکە باوەڕی وابوو (صدام) تاکە کەسێکە دەتوانێت نەهێڵێت تاران دەست بگرێت بەسەر مەواردی نەوت لە کەنداوی عەرەبی‌دا و ئەلکسندەر هیگ ڕایگەیاند کە کیسی زۆر دەترسا ئێران لەو جەنگەی‌دا سەرکەوێت. بەڵام هیگ کەیفی لەوە نەبوو یارمەتی هیچ کام لە عێراق یان ئێران بدرێت، بەڵکو خۆی و هاوڕێکانی بەلایانەوە سەیر بوو کە بینیان ناوی عێراق لە لیستی وڵاتە ئیرهابی‌یەکاندا ڕەش کراوەتەوە، کە هەڕەشەی لە ئیسرائیلی هاوپەیمانی ستراتیژی ئەمەریکا دەکرد. لە کاتێدا وەزارەتی دەرەوە بەرپرس بوو بەسڕینەوەی ناوی عێراق لە لیستی وڵاتە ئیرهابی‌یەکاندا، بەڵام کۆشکی سپی بە بێ هیچ ڕاوێژێك لەگەڵ هیك دا ئەو بڕیارەی‌دا، بۆ یە ئەم بڕیارە (هیك)ی زۆر تووڕە کردبوو، پاشان دەرکەوت کە کیسی و کلارك دەستێکی باڵایان بووە لەو ئیشەدا، ئەم

هەنگاوەی وای کرد کە بەبێ شەرم باس لە سیاسەتە نهێنییەکانی واشنتۆن بکرێت بەرامبەر عێراق.

کیسی و هاوڕێکانی لە کۆشکی سپی باش دەیانزانی کە مەلیك حسین ئامادەیە بۆ بینینی ڕۆڵی ناوەند کار (الوسیط) لە ناردنی ئەو چەکانەدا بۆ بەغداد، چونکە (صدام) هاوڕێ و پاڵپشتیەتی، هەروەها عێراق چاوگەی سەرەکی نەوتی ئوردونی بوو، بۆچوونی کیسی وابوو کە ئوردون باشترین شوێنە بۆ ئیشە نهێنییەکانی ئەمەریکا، لەبەر ئەوەی هاوسنوری عێراقە.

لە حوزەیرانی (١٩٨٢) کۆشکی سپی داوای کۆبوونەوەیەکی بۆ باس کردنی جەنگی عێراق ئێران کرد. ڕای زۆرینە لەو کۆبونەوەیەدا وابوو ئەگەر واشنتون دەیەوێت لەبەر دەم سەرکەوتنەکانی ئێراندا بوەستێت، پێویستە ئەو وێنە فۆتۆگرافیە ئیستخباراتیانە کە مانگە دەست کردەکانی ئەمەریکا لە بەرەکانی جەنگدا دەیگرن بنێرێت بۆ (صدام).

دوای سێ هەفتە ئەم وێنانە بە دەستی مەلیك حسین گەیشتە بەغداد، بۆیە ئەمەریکا بۆ گواستنەوە و گەیاندنی ئەو زانیاریانە (مەلیك حسین)ی بەکار دەهێنا تا دڵنیا بێت کەون نابێت و نادزرێت.

لە (١٧)ی کانوونی (١٩٨٣)دا (دۆنالد رامسفیلد)ی نێردراوی سەرۆك ڕیگان بۆ ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست گەیشتە بەغداد و نامەیەکی دەست نوسی (ڕیگان)ی بە (صدام) دا، کە تیایدا داوای گەڕانەوەی پەیوەندی دیبلۆماسی و دەورەکردنەوەی کاری سەربازی دەکرد لەگەڵ بەغدا.

تیکر لەگەڵ رامسفێلددا هاتبوو بۆ بەغداد و روونی کردەوە کە ئەم نامەیە بووە بەهۆی لایەنگیری تەواوی ئەمەریکا بۆ عێراق.

لەساتی جەنگی ئێران-عێراق دا لەلایەن ئەمریکاوە بانکی (اکزیم) تەرخان کرابوو بۆیارمەتیدانی عێراق ، لە(بەهاری ١٩٨٤) دا فشاری خرایە سەر کە بڕی (٥٠٠ملیۆن دۆلار) دابین بکات بۆ ڕاکێشانی بۆری نەوت بۆ (عەقبە) کەڕۆژانە (١٠٠٠٠٠٠) بەرمیل نەوتی دەگواستەوە ئەردەن و لەوێشەوە بۆ (دەریای سور) تا ئێران نەتوانێت ناردنی نەوتی عێراق پەك بخات ، چونکە هەڕەشەی لێدانی بەندەری (هورمز)ی دەکرد ، دواتر کۆمپانیای (بتیشل) لە کالیفۆرنیا جێ بەجێ کردنی ئەم پڕۆژەی گرتە ئەستۆ .

(صدام) ڕەزامەندی خۆی دەربڕی لە سەر پڕۆژەکە بە مەرجێك ئەمەریکا گەرەنتی بداتێ کە ئیسرائیل هێرش ناکاتە سەر ئەو هێڵە، چونکە هێڵەکە بەناو خاکی ئوردوندا دەچێت، کەتەنها چەند کیلۆمەترێك لە ئیسرائیلەوە دوورە.

لە شوباتی (١٩٨٤) لە دانیشتنێکی نێوان تارق عەزیز و ریتشارد مێرفی یارمەتی دەری وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکادا لە بەغداد، عەزیز ڕایگەیاندا کە (صدام) جەخت دەکات لەسەر ئەوەی کە دەبێت ئەمەریکا ڕاستەوخۆ دەست وەردات لەم پرۆژەیەدا، ئەگەر نا ئەوا عێراق پڕۆژەکە هەڵدەوەشێنێتەوە. هەروەها بانقی (أکزیم) یش نەیار بوو بەوەی ئەمەریکا قەرزی زیاتر بداتە عێراق، لەبەر ئەوە دەترسا عێراق نەتوانێت قەرزەکان ببژێرێت، ئەمەش کێشەی دووەم بوو کە روو بە رووی واشنتۆن دەبووەوە .

سکرتێرەکەی شولتز لە وەزارەتی دەرەوەدا لە (١٢)ی حوزەیرانی (١٩٨٤)دا یاداشتنامەیەکی نهێنی نارد بۆ دۆناڵد گریکی کۆنە لێپرسراوی (CIA) و ڕاوێژکاری بۆش بۆ ئاسایشی نەتەوەیی کە دوو

پاشکۆی لە خۆ گرتبوو، یەکەمیان: لە بارەی هێڵە نەوتی‌یەکەی عێراقەوە بوو، دووەمیان: خاڵە پشتگیری‌یەکانی (جۆرج بۆش)ی تیا بوو کە داوای لە سەرۆکی بانق دەکرد یارمەتی پرۆژەکە بدات.

یاداشت نامەکە وای نیشان دەدا کە نرخی پرۆژەکە بە بلیۆنێك دۆلار دەگات، هەروەها ئەو داواکاری‌یەی عێراق و ئوردونیشی خستبووە روو کە لە بیتشیل کردبوویان، دەبێت (٢٥)ی حوزەیران دواکات بێت بۆ بەشداری کردنی تایبەتی و ڕەسمی ئەمەریکا، هەروەها موزەکەرەکە پیشانی دەدا کە ئەم پرۆژەیە خۆی لەخۆی‌دا تاقی کردنەوەیەکی سیاسی ئەمەریکایە بەرامبەر عێراق ، جۆرج بۆش لەوەو پێش پشتگیری یارمەتی دانی نهێنی سەربازیی بۆ عێراق کردبوو.

پەیوەندیەکانی نێوان واشنتۆن و سەرۆکی عێراق گەلێك گەرم و خۆش بوو لەسەر هەردوو ئاستی نهێنی و ڕەسمی. (صدام) دەولیەن بە لە یاسا دەرچوو دەژمێردرا، بەلاَم لەبەر ئەوەی کۆشکی سپی بەرژەوەندی خۆی لەگەڵیدا دیاری کردبوو، بۆیە ئاسایی بوو ئەمەریکا واز لە هەمووی بهێنێت و پەیوەندی دیبلۆماسی لەگەڵ عێراقدا بکاتەوە و لە ڕۆژی (٢٦)ی تشرینی دووەمی (١٩٨٤) کە ڕۆژی پەیوەندی ڕەسمی نێوان ئەمەریکا و عێراقە، سەرۆك ڕێگان پێشوازی لە تاریق عەزیزی وەزیری دەرەوەی عێراق کرد، وەکو تەعبیرێك لە دۆستایەتی نێوان ئەمەریکا و عێراق.

هەروەها لە بەهاری (١٩٨٥)دا لە وەزارەتی دەرەوەدا نوسینگەیەکی تایبەت دامەزرا بۆ بەڕێوە بردنی سیاسەتی ولاَتە یەکگرتووەکان لە ماوەی جەنگی عێراق – ئێراندا.

بەرپرسێك لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا بە بازرگانێکی ڕاگەیاند کە پەیوەندی‌یان لەگەڵ عێراقدا زۆر زۆر باشە، ئیتر دوای ئەوە بەغداد بوو بە شەریکێکی ڕەسمی بۆ ئەمەریکا، (صدام) هەرچەند هەلی بۆ هەڵکەوتایە داواکاری‌یەکانی لەسەر ڕێگان قورستر دەکرد.

کۆمەڵێك کە پێك هاتبوون لە گەورە لێپرسراوانی ئاسایشی نەتەوەیی و پەنتاگۆن و وەزارەتی دەرەوە و (CIA) لە (٢٣)ی تەمموزی (١٩٨٦)دا لە کۆشکی سپی کۆبوونەوەیەکیان بەست بۆ گفتوگۆ کردنی یارمەتی دانی ئەمەریکا بۆ عێراق.

خشتەی کارەکانی ئەم کۆبوونەوەیە لەسەر داواکاری باڵوێزخانەی ئەمەریکا لە بەغداد بۆ چۆنیەتی گواستنەوەی چەکە ئەمەریکی‌یەکان لە ئوردونەوە بۆ عێراق بوو.

دوای ئەو کۆبوونەوەیە ڕیتشارد مێرفی بروسکەی لێدا بۆ باڵوێزی ئەمەریکا لە بەغداد و وتی: لەبارەی چەك ناردن بۆ عێراق کۆتی زۆری لەسەرە و هەر ئیشێکی لەم جۆرەش ئاگاداری کۆنگرێسی دەوێت، بەمەش کارەکە ئاشکرا دەبێت و ئابڕوو چوونی لە دوایە، هەرچەند پسپۆڕان لە واشنتۆن لەو باوەڕەدان ئەم چەکانە کاریگەری‌یەکی ئەوتۆی نی‌یە لەسەر جەنگەکە بە شێوەیەکی گشتی، بەڵام ئامادەبووانی کۆبوونەوەکە بێ دەنگ نەبوون لە دەست نیشان کردنی ڕێگەی تر بۆ یارمەتی دانی عێراق. لە سەرەتای ئەو ساڵەدا ئێرانی‌یەکان هێرشەکانیان دەست پێ کرد، ئەم هێرشانە بارودۆخی سەربازیی عێراقی تێکدا، جەنگەکە بە ئاشکرا بەرە و گڕگرتن دەچوو، لەو لاشەوە وەکالەتی ئیستخباراتی مەرکەزی زۆر دڵگران بوو بەوەی (صدام) پشتی بەو زانیاری و ئامۆژگاری‌یە نهێنی‌یانەیان نەبەستووە کە بۆیان ناردبوو،

وا دەچوو (صدام) حەز نەكات وەڵامی ئەم هێرشانە بە مووشەكە ئاسمانی‌یەكانی بداتەوە بۆ ڕاگرتنی توانای سەربازیی خۆی.

لەو كۆبوونەوەیەدا بە كۆی دەنگ بڕیار درا سوود لە تواناكانی جۆرج بۆش وەربگیرێت، ئەوەش گرنگ ترین بڕیار بوو كە لەو كۆبوونەوەیەی كۆشكی سپی‌دا درا، چونكە بوش خەریكی گەشتێك بوو بۆ چەند وڵاتێكی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەوانەش ئوردون و میسر داوا لە بوش كرا داوا لە مەلیك حسین و حسنی موبارەك بكات كە ئامۆژگاریەكانی ئەمەریكا بە (صدام) بگەیەنن بۆ ئەوەی هێزی ئاسمانی زیاتر بەكار بهێنێت.

بوش لە (٤)ی ئابی (١٩٨٦)دا گەیشتە قاهیره و داوای لە حوسنی موبارەك كرد بە (صدام) بڵێت هێزی ئاسمانی بە شێوەیەكی باشتر دژی سەربازە ئێرانی‌یەكان بەكاربهێنێت.

سەرۆكی میسری شەریكێكی مەعقولی ئەمەریكی‌یەكان بوو، هەروەها هاوڕێیەكی دڵسۆزی (صدام) و نێرەرێكی چاكی چەكیش بوو بۆی، چونكە موبارەك زۆر پێویستی بە نەوت و پارە و هاوپەیمانی سیاسی بوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

موبارەك لە ساڵانی هەشتاكاندا نزیكەی بڕی (٣,٥) ملیۆن دۆلار موشەكی بە (صدام) فرۆشت، بەڵام تا ئێستاش (صدام) ئەو قەرزەی میسری نەبژاردووە.

موبارەك و ئەندامانی حكومەتەكەی لە ساڵی (١٩٨٤)دا ڕازی بوون هاوكاری عێراق بكەن لە پرۆژەی (كوندور ٢)دا كە بەرنامەیەكی نهێنی دروست كردنی موشەكی بالیستی بوو بە هێزی ئەتۆمی.

مبارك ناوەندێك بوو بۆ فرۆشتنی چەك بە عێراق، كەناڵێك بوو بۆ گواستنەوەی تەكنەلۆژیای چەكە ئەمەریكی یەكان بە نهێنی بۆ عێراق.

دوای ئەوەی بوش نامە نهێنی یەكانی دایە موبارەك بۆ (صدام)، لە ناكاودا هێزە ئاسمانیەكانی عێراق بۆمبارانی خۆیان چڕتر كرد دژی ئێران.

كاربەدەستێكی كۆشكی سپی روونی كردەوە بە هاتنی ساڵی (١٩٨٧) ئەمەریكایی یەكان لەبەرەكانی جەنگدا ئامۆژگاری تەكنیكی سەربازییان دەدایە عێراق، زۆر لە ئەفسەرە ئەمریكی یەكان خۆیانیان لە بەرەكانی جەنگدا دەدیتەوە لەگەڵ سەربازە عێراقی یەكاندا لە سنورەكانی ئێران تەنها ئەمەریكی یەكان نەبوون دەچوونە بەرەكانی جەنگ، بەڵكو بۆ كەسایەتی یە سەربازی یەكانی بەریتانیا و فەرەنساش هەبوو بچنە ئەو شوێنە.

بەڵام ئەمەریكی یەكان لە لایەن خۆیانەوە زیاتر گرنگی یان دەدا بەستراتیژیەت و یاسای جەنگ و توانای ئەفسەرە عێراقی یەكان، عێراق هەرچی زانیاری یەكی پێویست بوایە پێیان دەدا، بەڵام تەنها كێشەیەك كە دەهاتە پێش بۆ ئەمەریكی یەكان هەندێك جار (مستحیل) بوو بتوانن هێڵەكانی پێشەوەی بەرەكانی جەنگ دیاری بكەن، ئەویش بە هۆی ئەو شەڕ و پێكدادانە كە ڕووی دەدا، بۆیە لە ئەنجامی ئەوەدا هەندێك جار هەندێك لە ئەفسەرە ئەمەریكی یەكان خۆیانیان لە ناوچەكانی ئێراندا دەدیتەوە.

ئەمەریكا هەمیشە سوور بوو لەسەر ئەوەی جۆرە كەرەسەیەكی سەربازی بداتە عێراق، عێراق نەتوانێت خۆی دروستی بكات، یان بە ئاسانی دەستی نەكەوێت، ئەوەی دوای ڕاوێژێكی زۆر لەگەڵ ئەفسەرە

ئەمەریکایی‌یەکاندا دەبوو کە لە عێراقدا بوون، ئەو کەرەستانەش بریتی بوون لە ئەدەواتی یەدەکی زۆر ورد و ئامێری ئەلیکترۆنی و تەکنەلۆژیای زۆر پێشکەوتوو.

لە کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٨٧)دا جەنگی ئێران – عێراق چوو بووە ساڵی حەوتەمەوە، (صدام) حسین زۆر پێویستی بە یارمەتی بوو، پاش ئەوەی ئێرانی‌یەکان هاتنە قوڵایی خاکی عێراقەوە، کەشتی‌یە بێ لایەنەکان زۆر جار دەکەوتنە بەر هێرشی ئاگری عێراق و ئێران، بۆیە ئەمەریکا گرنگی‌یەکی تایبەتی دا بە کەشتی‌یە کوێتی‌یەکان، چونکە کوەیت وڵاتێکی نەوتی دەوڵەمەند بوو، کێشەی گەورە لێپرسراوانی کوەیتیش پارێزگاری کردنی کەشتی‌یە نەوتی‌یەکانیان بوو، لە لایەن مۆسکۆ یان واشنتۆنەوە.

بەرپرسە ئەمەریکی‌یە پایە بەرزەکان لەوانە ( کاسپر و انیبرگر و جۆرج شولتز و ولیام کرۆی) سەرۆکی هەیئەی ئەرکانی هاوبەش لە ئازاری (١٩٨٧)دا بڕیاریان دا پارێزگاری لە کەشتی‌یە نەوت بەرە کوەیتی‌یەکان بکەن لە کەنداودا.

دوای دوو مانگ لە (١٧)ی ئایاردا فڕۆکەیەکی جەنگی عێراق هێرشی کردە سەر (فرگە)یەکی ئەمەریکی بە ناوی (ستارك) و (٣٧) نەفەر کە سەرنشینی بوون کوژران، بەڵام هەرزوو چاو لەم ڕووداوە قوچێنرا بەوەی کە بە هەڵە ڕووی داوە، لە ئەنجامی ئەم ڕووداوە بەغداد داوای لێبوردنی کرد و بەڵێنی دا قەرەبووی خێزانی کوژراوەکان بکات، ڕووداوی (ستارك) سەلماندی کە بارودۆخ وا دەگەیەنێت (مجازفە)ی زۆر تیایدا ڕوودەدات، بۆیە سەرۆك ڕێگان بە ڕەسمی ڕایگەیاند وڵاتە یەکگرتووەکان ئاڵای دیکە لەسەر کەشتی‌یە نەوتی‌یەکانی کوەیت بەرز

دەكاتەوە بەوەش (اسطول)ە ئەمەریكی‌یەكان دەتوانن شوێنیان بكەون، لە كابیتول هیل – بینای كونگرێس – راگەیاندنی هەڵكردنی ئاڵای دیكە دەنگی ناڕەزایی بەرزكردەوە، هەندێك لەئەندامانی كۆنگرێس داوایان كرد پەنا ببرێتە بەر یاسای دەسەڵاتە جەنگییەكان (قانون السلطات الحربیة) ئەگەر ئەمەریكا دەیەوێت ڕۆڵێكی بەرچاوی هەبێت لەم (مغامرة) پڕ مەترسیەدا. كۆشكی سپی لەلای خۆیەوە ئەو بیرۆكەیەی (رەفز) كردو ریتشارد مێرف لەوەزارەتی دەرەوەدا رایگەیاند كەهەڵگرتنی ئاڵای زیاتر، لەبەرەنگاری لەخۆكردن بەولاوە هیچی تر نی یە، كەمەبەستی تیایدا پارێزگاری ئازادی كەشتی یەوانی و چوونی نەوتە، ئەمەش بەشێكە لەستراتیژی گشتی، لەگەڵ ئەوەش دا مێرف هۆشیاری دایە ئێران– نەك عێراق– بۆ هەر هێرشێك بكرێتە سەر ناوگانی ئەمریكی لەناوچەكەدا، ئەوا (ئەمریكا) رادەكێشێ بۆ بەشداری كردن لەو جەنگەی لەكەنداودا هەڵگیرساوە.

هەندێك لەئەندامانی كۆنگرێس رایانگەیاند سوور دەبن لەسەر نووسینی دەعوەیەك لەدادگای فیدراڵی دژ بەسیاسەتی سەرۆك رێگان لەكەنداودا، تا سەرۆك ناچار بكەن ملكەچ بكات بۆ یاساكانی دەسەڵاتی جەنگی، بەڵام لەكۆتایی دا دەعواكە رەفز كراو (فرانك كارلوس)ی راوێژكاری ئاسایشی نەتەوەیی موزەكەرەیەكی نارد بۆ (جۆرج شولتز)و تیایدا داوای لێكرد لەنەتەوە یەكگرتوەكان دا ئەوپەڕی هەوڵ بدات بۆ وەستاندنی جەنگی عێراق– ئێران، لەموزەكەرەكەدا هاتبوو كەكۆنگرێس پشتگیری سیاسەتەكانی ئەمەریكا ناكات لەكەنداودا.

شوڵتز نیۆركی بەجێ هێشت بۆ بەشداری كردن لەگفتوگۆكانی ئەنجوومەنی ئاسایش كەهەموو ئەندامان بەتێكڕا دەنگیان دا بۆ

دەرکردنـی بڕیارێـك بـۆ وەسـتانی جـەنگ ، هـاوینی (١٩٨٧) پڕبـوو لەهـەوڵ‌و کۆششـی دیبلۆماسی بـۆ بەرقـەرار کردنـی ئاشـتی و ڕووداوی سەربازی لەکەنداودا.

سەبارەت بە (ئـەورووپاو صـدام) ئیتاڵیا هاتـە ناومەسـەلەی بەرنامـەی پڕچەك کردن و هاوکاری ناردنی چەك بۆ صدام .

هـەردوو حکومـەتی (ئیتاڵیـا و ئـەمـەریکا) دڵخۆشـن بـەوە کەیـەك بـۆ چوونیان هەیە لەبەرەنگاری کردنی ئیرهاب و بازرگانی بێ هۆشکەرەکان (مخدرات).

تەنیا شتێك کە ڕۆژنامـەکان لـە ڕۆژی داهاتوودا باسیان نـەکرد، ئـەو باسە بوو کەلە سەر (صدام) و شەڕی عێراق – ئێران کرا. کـە پێـنج سـاڵ بوو هەڵگیرسا بوو.

کۆشکی سپی لەو کاتەدا بە ڕێك و پێکـی ڕاپۆرتـە ئیسـتخباراتیەکان لەبارەی جەنگەوە دەگەیشتە دەستی، وە بەردەوام سـەرقاڵی چـەك نـاردن بوو بۆ عێراق بە نهێنی.

( کراکسـی و ئەنـدریۆتی و ڕیگـان ) سـێ قـۆڵی باسـی مەترسـی داگیرکردنـی عێراقیـان دەکـرد لەلایـەن ئێرانـەوە. بۆیـە هەرسـێ بـە پێویستیان زانی هەوڵێك لەو بارەیەوە بدەن، ئەمەریکی‌یەکان دەیان زانـی هیچ ئیشێکی ئاشکرایان بۆ ناکرێت، بەهۆی سیاسـەتە تایبەتی‌یەکانی ئەمـەریکاوە کەلەسـەر نـاردنی چـەك بۆ عێراق دایناوە، بۆیـە هـەوڵیان دا پشتگیری (ڕۆما) بکەن.

(ئەندریۆت)یش لە ساڵی (١٩٩٣)دا لە نووسینگەکەی خـۆی لـە ڕۆمـا ڕاستی ئـەم داواکاری‌یـەی دوپـات کـردەوە و ئـەوەیشـی ڕەت کـردەوە کـە دەستی هەبووبێت لەگەڵ مافیای سەقەلیەدا.

هەروەها کاربەدەستێکی پایە بەرزیش لە کۆشکی سپی ڕاستی داواکاریەکەی دوپات کردەوە ئیتاڵیایەکان خۆیانیان هاویشتە بەرەی عێراق بۆ بەدەست هێنانی بەرژەوەندی بازرگانی و ئامانجی پەیوەندار بە سیاسەتی دەرەوە، وە ئیتاڵیا نێوانی خۆی لەگەڵ (صدام)دا خۆش کرد و لەگەڵ فەرەنسادا بەربەرەکانێی ڕۆڵی یەکەم نێرەری تەکنەلۆژیا و چەکی ڕۆژ ئاوای بۆ عێراق دەکرد، لە حەفتاکاندا ئیتاڵیا بەشداری لە پرۆژەی نەوەوی عێراقدا کرد کە ناسرا بوو بە (اوز ایراك) هەروەها لە ساڵی (١٩٧٧)یشدا گرێ بەندێکی بە بەهای (٥٠) ملیۆن دۆلار لەگەڵ عێراقدا ئیمزا کرد بۆ گواستنەوەی چوار تاقیگە بۆ دەزگای وزەی ئەتۆمی عێراق. کە یەکێکیان بۆ خەست کردنەوەی بلۆتۆنیۆم بەکار دەهات، وە ئەم تەکنە لۆژیایە پاڵپشتێکی بنەڕەتی بوو لە یارمەتی دانی (صدام) دا بۆ بەهێز کردنی ئاواتەکانی لەبواری چەکی نەوەویدا، وە لە ساڵی داهاتوودا ئیتاڵیەکان دەستیان دایە مەشق دانی سەد زانا و کرێکاری هونەری عێراقی لەسەر بەکارهێنانی ئامێرەکانی ئەو کارگەیە کە تیایدا ئیشیان دەکرد.

کۆشکی سپی بۆ ئەم یارمەتی دانە هیچ ناڕەزاییەکی دەرنەبڕی، هەروەها شتێکی سەیریش نەبوو لەلای واشنتۆن کاتێك حکومەتی ئیتاڵیا لەساڵی (١٩٨٠) گرێ بەندێکی لەگەڵ (صدام) دا مۆر کرد بەبەهای نزیکەی دوو ملیۆن دۆلار لەبەرامبەر دانی (اسطول)ێکی دەریایی ئامادە کراوی بچووك بە عێراق، وە ئەم سەفقە گەورەیە بریتی بوو لە چوار (فرقاطە) و شەش فڕۆکە و کەرەستەیەکی و فڕۆکەیەکی پشتگیری و حوزێکی (عائم).

ئەو بانقە کە داوای لیٚ کرا کە یارمەتی عێراق بدات، بانقی کاری نیشتیمانی بوو، کە دەزگایەکی حکوومی بوو لەساڵی (١٩٨٣) بە ڕوکەش بۆ بەرژەوەندی کرێکاری ئیتاڵیا دامەزرا بوو لە ساڵی (١٩٨٠) ئەم بانقە ناوبانگی جۆراو جۆری بەسەردا بڕا، وە بەشێوەیەکی تەواو خۆی خستە ناو سیاسەتی ئیتاڵیاوە، وە لەو کاتەدا بەوە ناسرابوو کە یەکێکە لەو بانقانەی وولات کە بەناوبانگە لە کاری تەزویر و گەندەڵیدا، لەساڵی (١٩٨٤) ئیتاڵیا بایی (١٦٤) ملیۆن دۆلار، فڕۆکەی جۆری (اغوستا)ی بە عێراق فرۆشت، بەڵام ڕۆما پێویستی بە ڕەزامەندی ئەمەریکا هەبوو، چونکە فرۆکەکان لەلایەن (اغوستابڵ)ەوە فرۆشراو بوون، کە ئەویش بەڕەزامەندی (بل نیکسترون) لە وولاتە یەکگرتووەکان دروستی کرد بوو.

بەڵام بە نسبەت بانقی کاری نیشتمانی و عێراقەوە، ئەوا دەزگای ئیستخباراتی ئەمەریکا کەوتە بەدوادا چوونی ئەو پەیوەندییە زیاد لە ئەندازەیەی نێوان بانقی ئیتاڵی و دەڵاڵەکانی (صدام).

لە یەکێك لە ڕاپۆرتەکانی وەکالەتی ئیستخباراتی بەرگریدا هاتووە کە عێراق کە لقی بانقی لە باکوری ئیتاڵیا بەکارهێناوە بە دانی پارەی ئەو (شەحنە)یە بە بەغدا کە بریتی بوو لە نۆ ملیۆن مینی دژە مرۆڤ بە نرخی (٢٢٥) ملیۆن دۆلار.

کاتێك عێراق لە ساڵی (١٩٨١)دا دەگەڕا بە دوای مین و یارمەتی دا ئەو کاربەدەستەی کڕیاریی (مشتريات) (صدام) هەوڵی دەدا، لەیەك کاتدا لە بانقی کاری نیشتمانی و حکومەتی ئیتاڵیا نزیك بێتەوە، تاوای لێ هات لە ماوەی دە ساڵی داهاتوودا، داواکاریەکان یەکسەر لە وەزارەتی بەرگری عێراقەوە دەنێرا بۆ باڵوێزخانەی ئیتاڵیا لە بەغداد.

ئەو مینانەی عێراق دەیویست بیکڕێت بریتی بوو لە ئامێرێکی پلاستیکی بازنەیی تەقینەوەیی کە دەتوانرێت لە فڕۆکەوە بوەشێنرێت یان فڕێ دەدرێتە خوارەوە بەسەر بیاباندا بە ئاسانی، لەگەڵ قاچ پیانانیدا دەتەقێتەوە و کەسێکی بێ لاق لە شوێنی خۆی بەجێ دەهێڵێت.

لە بەهاری (١٩٩١)داو دوای گەردەلوولی بیابان، ئەم مینە بکوژانە بوونە سەرچاوەی ترسێکی زۆر گەورە بۆ وولاتە یەکگرتووەکان و هێزە هاوپەیمانەکان کە لە نزیك سنورەکانی باکوری عێراق مۆڵیان بەستبوو.

بەڵام پیاوانی فریاکەوتنی نێو دەوڵەتی زۆر بەزوویی سەرچاوەی مینەکانیان دەست نیشان کرد کە کۆمپانیایەك بوو بە ناوی (فالسیلا)کە نیوەی هی پیاوێکی ئیتاڵی بوو بە ناوی (جانی أغنیلی) کە تا ئێستاش بە پادشای ئیتاڵیای بێ تاج بەناوبانگە، ئەو نیوەکەی تریشی هی کۆمپانیای (فیات) بوو، بەڵام دووەمیان لەدوایدا ئەوەی ڕەت کردەوە کە هیچ ئاگایەکی لەو چەك ناردنە نهێنی‌یە بوبێت بۆ عێراق.

لەکاتێکدا (صدام) کێشەی ئابووری هەبوو لە ساڵی (١٩٨٢)دا نزیکەی بلیۆنێك دۆلار لە بانقی کاری نیشتمانی ڕاکێشا، چونکە بەرهەمی عێراق لە نەوتی خاو دابەزی بۆ یەك لەسەر سێ، کاتێك (صدام) سوپاکەی بە سنوری عێراق – ئێران دا بڵاوکردەوە، دوای ئەوەش قازانجی نەوتی عێراق لە (٢٨) بلیۆن دۆلارەوە لەساڵی (١٩٨٠) دابەزی بۆ (٨) بلیۆن دۆلار لە ساڵی (١٩٨٣).

## زیندان و گرتوخانەکانی بەعس

زیندانیـەکانی صـدامی دیکتـاتۆر بەشـێك بـوون لـەو جێگایـەی کـە مرۆڤی کوردو عەرەب و تەواوی گەلانی عێراقی تێدا جینۆساید کراوە ، جۆرەها شێوازی نامرۆڤانەی وەك کوشتن و ئەشکەنجەو خنکانـدن و لـە سێدارەدان ئـەنجام دراوە بـەجۆرێك تـەواوی زینـدانیـەکانی بـەعس کـە بەسەدان زینـدانی بـووە سـەراپا و بـەردەوام لەتـەواوی تەمـەنی بەعسـدا بەبیانوی بیٚ بناغـەی جۆراوجۆر کوردو عـەرەبیان تێدا لەبەین بردووە ، زیندانیەکانی بەعس کەهیچ کات نەیدەهێشت ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ سـەردانی بکـەن و چـاویان پێـی بکـەوێت چـونکە دوربـوون لەهـەموو خزمەتگوزارییەکی تەندروستی و ئاوو ئاوەڕۆو بیٚ خۆراك و کارەباو پڕ لـە جۆرەهـا میکـرۆب و زینـدەوەری زیانبـەخش هەمەچەشـنە ئـامێری سزادانیان تیا بەکار هێناوە لە کێبڵ و کارەباو بوتڵ و پلایس و گازو سوتاندن بە ئوتوو .....هتد

ڕێکخراوی ( لێبووردنی نێودەوڵەتی ) دەربارەی تەنها زینـدانی (ئەبو غرێب) دەڵێت : سەر بە زیندانی ناوەندی بووە لە ڕێگای دەزگای نهێنی تایبەتـەوە بەڕێوە دەبرا وە ڕێگایەکی چونەژورەوەی تایبەتی هـەبوو بە پاسـەوانی زۆر پارێزگـاری لـیٚ دەکـرا زۆر بـە تونـدی ، لـەناو قاعـەکانی زیندانەکـەدا چـوار تـەوالێت هـەبوو زینـدانیی دەبوو لەوێدا دەم و چاوو قـاپی خواردنەکـەی بشـوات و سـەرئاویش بکـات بـەڵام ئـاوێکی زۆر سـاردیان بـۆ دانـابون تاتوشـی نەخۆشـییان بکـات ، ڕۆژی سـیٚ جـار

دەیانکردنە سەر ئاو هەرجارەش لە یەك دوو دەقیقەدا دەبوو ئەو کارانە ئەنجام بدات ، مانگی دوو جاریش (١٠) دەقیقە دەیانکردنە هەمان شوێن بۆ شۆرینی سەرو لاشەی !

هەروەها دوو دوو زیندانییەکانیان دەکردە ئاودەست و ئەگەر کەمێك لەمۆڵەتی خۆیان دووا بکەوتنیایە بە کێبڵ و زنجیر لێیان دەدان ! وەهەرکەسێکیش ئاوی زۆر سەرف بکردایە جارێکی تر چونە سەرئاویان لێ مەنع دەکرد ، ڕۆژانەش لە سەعات حەوتی بەیانی تا ١١ی شەو خەو زۆر قەدەغەبوو !! قسە کردن لەگەڵ کەسەکانی ناو قاعەکە قەدەغەبوو ، لە زستان و هاوین دا هۆکاری گەرم کردنەوەو فێنك کردنەوە نەبوو .

هاوڵاتییەکی عێراقی بەناوی ( عبدالحمید العباسی ) ئەندامی حزبی (الدعوة الاسلامیة)ی شیعە زیندانیی بوو لە زیندانیی ( قصر النهایة ) لە کتێبی (صفحات سوداء من بعث العراق) دا دەڵێت : کردمیانە ژورێکی تاریکی سێ بە چواری بێ پەنجەرە ، سێ کورسی ئاسنی تێدا چەسپ کرابوو بەزەوییەوە ، بە پشتی هەرکورسییەکەوە عەمودێکی دوو مەتری پێوە بوو ! لەسەر کورسیەکیان ئەڵقەیەکی ئاسنی پێوەبوو کەدەیانکردە ناوقەدی گیراوەکان و بەرزو نزم دەکرایەوە بەڵام ئەڵقەکە زۆر تەسك بوو ، لەهەمان ژووردا بۆری ئاو هەڵواسرابوو قولاپی پێوەبوو بەقولاپەکانیشەوە دوو حەبلی پێوە هەڵواسرابوو، لەسەر کورسی دووەمیان پلاستیکی لەسەر بوو کە ڕەبت بوو بەکێبڵی کارەباوە و بەسرابوو بەو دوو حەبلی قولاپەکانەوە ، دیوارەکانی ژورەکەش ئاسەوارێکی زۆری لەشەك و خوێنی پێوەبوو ، لە ژورەکەدا هیچ شوێنێکی هەواگۆڕکێی نەبوو پاشان ژوری ئینفرادییان تەنها ٧٥ سم بەرزبوو بە دەرگایەکی ئاسنین لەدەرەوە دادەخرا ، بەسەقلە ژورەکانەوە گڵۆپێکی پێوەکرابوو بەڵام کارەبای نەدەخرایە سەر لەبەر خۆکوشتن ، ئەو ژورە تەنهاییانەی کە هەیانبوو یەك ئینسانی دەگرت بەڵام زۆرکات دوو سێ کەسیان تێ دەکرد ، دەڵێت ئەو قاعەیەی ئێمە چەند بەشێك

بوو هەر بەشەی (٤٢) ژوری ئینفرادی تێدابوو ، تەنها سەعات (١٠) ی بەیانی دەیانهێشت بچینە سەر ئاو لەماوە (٢٤) سەعات دا .

**ئەو زیندانانەی کە لە بەڵگەنامەکانی مافی مرۆڤدا هاتووە مافی مرۆڤی تیا پێشێل کراوە :**

١/ زیندانی ابو غریب – ناوچەی أبو غریب لە بغداد – درێژییەکەی (١٠) کم دابەش کراوەبۆ ئەم بەشانە

أ/ موقف .

ب/ خفیەفە .

ج/ ثقیلە .

د/ بەشی ئیعدامات .

٢/ قصر النهایة –لە بغداد .

٣/ الفضلیة – لە بغداد ئەمیش دابەش بووە بۆ :–

أ/بەشی ئاساییەکان .

ب/ بەشی سیاسیین .

٤/ قصر مالح – لە بغداد .

٥/ بەڕێوەبەرێتی امنی عامە – لە بغداد .

٦/ پۆلی یەکەم– پۆلی مکافحەی چالاکی شیوعی .

٧/ پۆلی دووەم – پۆلی مکافحەی چالاکی قەومی .

٨/ پۆلی سێیەم – پۆلی مکافحەی چالاکی کوردی .

٩/ پۆلی چوارەم – پۆلی مکافحه چالاکی اسلامی .

١٠/ زیندانی رقم (١) معسکر الرشید .

١١/ زیندانی رقم (٣) الزعفرانیة .

١٢/ زیندانی الزعفرانیة للنساء .

١٣/ زیندانی بعقوبة .

١٤/ زیندانی نقرة السلمان السیاسی .

١٥/ زیندانی الحلة الکبیر .

١٦/ زیندانی الثؤلي الرابعة – وزارة الدفاع – بغداد .

١٧/ موقف الحارثیة– العسکری – بغداد .

١٨/ گرتوخانه الرجبیه .

١٩/ گرتوخانه العطیشي للتعذیب – کربلاء .

٢٠/ زیندانی حی العباسی – کربلاء .

٢١/ امنی الکوفة – النجف .

٢٢/ گرتوخانەی امنی نجف – نجف .

٢٣/ گرتوخانەی امنی حلة – حلة .

٢٤/ زیندانی الطهمازیة – حله .

٢٥/ گرتوخانەی محاویل – حله .

٢٦/ گرتوخانەی عطیلة الجسر – کاظمیة – بستان الخاتون .

٢٧/ گرتوخانەی امنی کاظمیة – کاظمیة – ساحة الزهراء .

٢٨/ شرطة الکاظمیة – کاظمیة .

٢٩/ گرتوخانه المخابرات – باب بغداد – کربلاء .

٣٠/ زیندانی عین زاله – موصل .

٣١/ گرتوخانەی سنجار – موصل .

٣٢/ گرتوخانەی امنی موصل – موصل .

٣٣/ زیندانی الغزلائي عسکری – موصل .

٣٤/ گرتوخانەی امنی العمارة – العمارة .

٣٥/ گرتوخانەی خیاله – عمارة .

(کێشەو قەیرانی کۆنغۆ ١٩٦١، دیواری بەرلین ١٩٦١، موشەکی کوبی ١٩٦٢، دومنیکان ١٩٦٥،تشیکو سلو فاکیە ١٩٦٨، شەڕی سنوری نێوان سین و سۆڤێت ١٩٦٩، شەڕی ڤێتنام) بەڵام ئەوەی مەبەست بوو ناوچەی کەنداوی عەرەبی بوو کە دەیانویست لەڕوی تریشەوە کۆنترۆڵی بکەن، سەرەتا بەریتانیا توانیبوی غەزوی خۆی لەناوچەکەدا بکات، بەڵام لە (١٦ی کانونی دووەم)دا (هارولد ولسون) سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا ڕایگەیاند کە بڕیاریانداوە هێزەکانیان لە (شرق الاقصی و شرق السویس) بکێشنەوە. وە بڕیاریدا هێزەسەربازیەکانیان لەناوچەی کەنداویش بگێڕنەوەدوای (١٥٠) ساڵ کە بەریتانیا بونی سەربازی خۆی لە ناوچەکەدا درکاندبوو ، بەریتانیا (٦) هەزار سەربازی خۆی لە بحرین و ناوچەکانی تردا کێشانەوە چونکە ساڵانە (١٥) ملیون جنەی ئیستەرلینی بۆ سەرف دەکردن، ئەم هۆکارەی کردە بەڵگە بۆ کشانەوەی ، بەڵام ڕۆژنامەی (التایمز)ی لەندەنی نوسیبوی کە مەسەلەی ئابوری هۆی سەرەکی کشانەوەی بەریتانیانەبوو، ڕۆژنامەی (فایننشاڵ تایمز) یش نوسییوی کە زۆرینەی چاودێران دەڵێن هەواڵی کشانەوەی بەریتانیا پەیوەستە بە سومعەی بەریتانیاوە کەلە جیهانی عەرەبیدا بەناشیرینی دەردەکەوێت. بەڵام وەزیری دەرەوەی بریتانیا ڕایگەیاند کە ( مانەوەی هێزی سەربازی بەریتانیا لە ناوچەی کەنداودا ئەبێتە هۆی تەفرەقە لەدواڕۆژا ) . لەگەڵ ئەوەدا بەریتانیا هێزی سەربازی لەناوچەکەدا گێڕایەوە بەڵام لەڕووی سیاسیەوە هەربە تۆکمەیی مایەوە. وەك ( محمد حسین هیکل ) دەڵێت : بەریتانیا هەیمەنەی سیاسی و دەریایی لەناو چەکەدا مایەوە و لێپرسراوێتی دەڤەرەکەی بەشێوەی ناڕاستەو خۆ هەر لە ئەستۆدا بوو لەڕوی سەربازی و سیاسیەوە.

کشانەوەی سەربازی بەریتانیا زەنگێکی ترسناك بوو بۆ دەوڵەتە عەرەبییەکانی کەنداو. کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی بەریتانیا ڕاستەو خۆ بڵاویان دەکردەوە کە سەرانی هەندێ لە وڵاتانی کەنداو ئامادەییان دەربڕیوە ساڵی (٢٥) ملیۆن جنەی بدەنە بەریتانیا بۆ پاراستنیان. بەڵام (دینس هیلی) وەزیری بەرگری ڕەدی کردۆتەوەو قبوڵی نەکردووە.

دوای ئەمە (ئەمریکا) هەوڵی دا نفوزی خۆی لەناوچەکەدا زیاد بکات، بەڵام زۆر دەترسا چونکە ئەو ناوچەیە لە سوریاو لوبنانەوە بەرەو کەنداو بە (خطر النار) ناودەبرا. (ئەمریکا)لە مەر بڕیاری سەرۆك ڕاستەوخۆ بەشێوەیەکی سەربازی هاتنە لوبنان و ئەردەن، ئەم دوو وڵاتەیان بە دەرگای چونە ژورەوەی باشوری ڕۆژ هەڵاتی ئاسیا دەزانیێ. لەڕوی دەریا یەکەی نەوتیشەوە تەماشای کەنداویان دەکرد، (ئەمریکا) دەیویست دەسەڵات بەسەر ئەوداهاتە بەنرخەدا بگرێ ئەوا دەتوانێ سەرجەمی هێزە سەربازی و کارگە پیشەسازیەکانی بەڕێوە ببات. لەسەربنەمای دروست کردن و گەشەپێدانی ململانێی ناوخۆی وڵاتانی عەرەبیش پێیان وا بوو دەتوانن بگەنە ئامانج، هەروەها لەلایەن زۆر ڕێکخراوی عەرەبی پاشکۆ بۆ ڕۆژئاوا کە یارمەتی دەدرێن تاپیلانەکانیان بگەیەنن بەجێ.

جۆرج براون لە بەردەم ئەنجومەنی گشتی بەریتانیادا ئێوارەی ٢٤ی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٦٨ ووتی ( پاشەکشەی سەربازی بەریتانیا لەڕۆژ هەڵاتی ناوەڕاست مانای کشانەوەی نفوزی نی‌یە، بۆ دانانەوە و دروست کردنەوەی نفوزی نی‌یە، بۆ دانانەوە و دروست کردنەوەی پرۆژەی لەو جۆرەش ڕیگا چارەی ئینقیلابی سەربازی پێویستەو

خوازراوە لە ناوچەکەدا کە سەرەتای دەست پێکردنی پیلانەکانمان دەبێت ) .

بەریتانیا نێردراوێکی خۆی بەناوی (غوروفوی روبرتس)ی وەزیری حکومەتی بەریتانی بۆ کارو باری دەرەوە ناردە ناوچەکە بۆ دروست کردنی ڕێکخراوێکی هاوبەشی (ئێران- کوێت- سعودیە) بۆ پاراستنی کەنداو. بەرهەمی ئەم بۆ چون و فیکرەیە سەری هەڵدا. ئەوە بوو (یوجین روستو)ی بریکاری وەزیری دەرەوەی (ئەمریکا) لە (٢٠ی ینایری ١٩٦٨)داوای کرد کە بگەنە (٤) ڕێکەوتن و بڕیارێك بۆ پاراستن و سایشی ناوچەکە ئەویش بە هاوکاری کردنی (ئەمریکا) و بەریتانیا و هەندێ لە دەوڵەتانی ناوچەکە دەبێت.

ڕوسیا ترسی لێ نیشت و لەڕێگای (ئینتەرتاس)ەوە ڕایگەیاند کە بەریتانیا و (ئەمریکا) دەیانەوێت کۆمەڵکاریەك لە نێوان (ئێران و کوێت و عێراق و پاکستان و یەمەن) دا دروست بکەن وەك هاوپەیمانێتی یەکی سەربازی تازە. بەڵام وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا وەڵامی دایەوە کە هیچ هەوڵێکی لەو جۆرە لە ئارادا بوونی نی‌یە ! دوای ئەوەی (جورج براون) لەپۆستی وەزیری دەرەوەی بەریتانی وازیهێنا لە (هوا تیهول) کەمقەڕی وەزارەتی دەرەوەی لێیە ڕایگەیاند هیچ گۆڕانێك بەسەر سیاسەتی دا نەهاتووە لە بڕیاردانی کشانەوەشدا، بەڵکو هەندێ مەسەلەی تەکتیکی زیاتر بووە کە پەیوەستە بەکشانەوەی سەربازیەوە و قابیلی قسە لێکردن و لێکۆڵینەوەن.

وەزیری دەرەوەی (نوێ) (مایکل سێوارت) هاتە شوێنی (جورج براون). یەکەم کاردانەوەی ئەم کردەوانەی بەریتانیا لەلایەن (مەلیك فەیسەڵ) ەوە بوو کەڕایگەیاند ناوچەی (کەنداو) لەدۆخێکی دژواردایە

بەهۆی ئەو ناکۆکیەی کەوتۆتە نێوان هێزە نێو دەوڵەتیەکانەوە بۆ دەست بەسەراگرتنی جیهان، وە سوربو لەسەر چارەسەری ئەو بارو دۆخە بۆ دابین کردنی ئاشتی و سەلامەتی ناوچەکە .

پاشان شای ئێران هەڵی دایە، دواتر پەیامنێری دبلۆماسی گۆڤاری (الاوبزرفر) ئەو قسەیەی جێگری حاکمی بەحرێنی نەقڵ کرد کەدەڵێ : بەریتانیا پێش پاشەکشێ کردنی چارەسەری ناکۆکیە ناو خۆییەکانی کردوین واتە بەپێچەوانەی (فەیسەڵ و شا) وە قسەی دەکرد، پاشتر ساڵی (١٩٦٨) یەکێتی ئیماراتی عەرەبی لە کەنداو ڕاگەیەنرا، بەهۆی پەیوەندی لەگەڵ بەریتانیا، (اوبرتس) کەهاتە کەنداو سەردانی زۆر لەدەسەڵاتدارانی کرد و پرسی پێکردن، دواین بۆچون کەوەریگرت و پێیانوت ئەوە بووکە بەریتانیا بونی سەربازی خۆی لە ناوچەکا بگۆڕێت بۆ سیستەمێکی بەرگری ئیقلیمی کە پشت ببەسێ بە (عێراق، کوێت، سعود) بەڵام عێراق کێشەی ناوخۆیی تێدا بوو، ترس بۆ دەرەوەی خۆی هەبوو لەوانە (تەماعی لە کوێت دا).

چارەسەریش تەنها بە دووشت زانرا، فشاریان لەسەر دروست بکرێت بە شۆڕش کردن لەناو خۆیان دا، عێراق و ئێرانیش بترسێنرێتە بەوەی کە بەیەکتر لایەکیان بەلاکەیتریان لادەبەین، تابتوانن فکرەی (التعاون الدفاعی الاقلیمی) پێك بهێنن.

کاتی نزیك بوونەی کشانەوەی هێزەکانی بەریتانیا کەدەبوو لەپێش (١٩٧١) بکشێتەوە لە (١٩٦٨/١/١٤)دا ڕۆژنامەی (صندای تلگراف) بڵاویکردەوە ڕەنگە بەریتانیا بەزویی و لەناکاودا بڕیاری کشانەوە بدات، بەڵام مەسەلەی داگیرکردنی کوێت لەلایەن (عبدالکریم قاسم) و تەماعی سعود لە (ابوظبي)داو داواکردنی (بەحرێن) لەلایەن ئێرانەوە، هەموو

مەسەلەکەش پەیوەست بوو بەعێراقەوە، واتە ئەگەر عێراق داوای کوێتی بکردایە ئێران و سعودیش داواکەی خۆیان بەجێ دەهێنا، بەڵام ئەگەر عێراق سەرکوت بکرایە لەو مەسەلە ئەوا هیچ نەدەهاتە پێش وەك بەربەست بۆ دروست کردنی ڕێکخراوی (التعاون الدفاع الأقليمي) چارەسەریش بۆ عێراق تەنها گۆڕینی سیستەمی حوکم و دەسەڵاتدارانی بوو!

## کێ سەدامی گەیاندە ئەو دەسەڵاتە و هاوکاری بوو ؟

ئەو حکومەتە ڕۆژ ئاواییانەی ئێستا گفتوگۆ لەو بارەیەوە دەکەن کەچۆن ڕێ لەوەبگرن، عێراق چەکی کۆکوژ دروست بکات، پەردەیەکی ئەستور بەسەر ئەو ڕۆڵەدا ئەدەن، کەخۆیان ساڵانێکی دورو درێژوو تا (١٩٩٠) ئەو کاتەی سەدام پەلاماری کوێتیدا، هەیانبوو لەپڕچەك کردنی (صدام حسین)ی سەرۆکی عێراق و دابین کردنی خەرجیەکانی، یەکێك لەوانەی ئەو کاتەدا ڕێژەری سیاسەتی ڕۆژئاوا بووە لەناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دەڵێ: (دوابەدوای شۆڕشی ئێران لەساڵی (١٩٧٩)دا، حکومەتە ڕۆژئاواییەکان یارمەتیان دەدا) بڕوایەکی واهەیە کەئەو (ئەمریکا)یەی سەدامی کۆتای پێ هێنا، لەساڵی (١٩٨٠ تا ١٩٨٨) کەشەڕی لەگەڵ ئێراندا دەکرد زانیاری زۆر گرنگ و زیندوی پێداوە، کەلەڕێی مانگە دەستکردەکانیەوە دەستی دەکەوتن، بەشێك لەمێژوو نوسانی سەربازی دەڵێن (ئەمریکا) تای تەرازوی ئەو شەڕەی بەلای عێراقدا قورس کرد، ئەوەش بەوەی کەلەناو کەنداودا ئالای خۆی لەسەر کەشتیە نەوتیەکانی کوێت بەرز دەکردەوە و دەیپاراستن لەکاتێکدا کە عێراق زۆر بێ پەروایانە کەشتییە ئێرانیەکانی بۆردومان

دەکرد، هەندێ دبلۆمات دەڵێن: ژمارەیەك کۆمپانیای (ئەمریکا) یی کەرەستە و پێکهاتەی ئەوتۆیان داوە بەعێراق کە بەدوو جۆر بەکار دەهێنرێن و دواتر عێراق لەبەرنامەی دروست کردنی چەکی بایە لۆجی‌دا بەکاری هێنان .

(سێز ئالان مۆندۆ) کەپێشتر باڵوێزێکی بەریتانیا بووە لەناوچەکەدا دەڵێ: ( (ئەمریکا)ییەکان ئەوەندە ترسی ئێران چووبووە دڵیانەوە، کەلەنێوان (١٩٨٠) تا (١٩٩٠) نەك تەنها دەستیان کردەوە بەوەی دانەوێڵە بەقەرز بدەنە عێراق بەڵکو پەیوەندییان لەنێوان دەزگا ئیستیخباراتیە سەربازیەکەی خۆیان و عێراقیشدا دروست کردەوە و سەدام قازانجێکی زۆری لەمەکرد ) .

(نیل بارتریك) سەرۆکی توێژینەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەئاژانسی خزمەت گوزاریەکانی بەرتانیای یەککگرتودا دەڵێ : ( زۆر ئاشکرایە کەڕۆژئاوا دیدو ڕای خۆی بەرامبەر بەسەدام نەگۆڕێ تائەو کاتەی کەبەپەلاماردانی کوێت دژی بەرژەوەندیەکانی ئەمان جولایەوە ) .

( فەرەنسا)ش ئەو نکۆلکاریەی دابووە سەدام کەساڵی (١٩٨١) فڕۆکەکانی ئیسرائیل بۆردومانیان کرد و تێکیان شکاند، (فەڕەنسا) لەڕادەی کۆمەکە سەربازیەکان دا، بۆسەدام دووەم دەوڵەتە و دوابەدوای یەکێتی سۆڤێتی جاران دێت لەلیستی ئەو دەوڵەتانەدا کەیارمەتی سەدامیان داوە، بەغداد بەبڕی (پێنج ملیار دۆلار) قەرزاری (پاریس)ە ، زۆربەی ئەو قەرزەش پارەی چەکی پەرەسەندووی ڕادارە کەلەساڵانی هەشتاکاندا بەسوی ئێجگار زۆر فرۆشراون بەعێراق، عێراق بەهۆی ئەو ئابلۆقە ئابووریەوە کەنەتەوە یەککگرتووەکان بەسەری‌دا سەپاندویەتی تەنانەت سووی ئەو قەرزەشی نەداوەتەوە.

لەكاتی جەنگی كەنداودا ساڵی (١٩٩٠) ئەفسەرە فەڕەنساییەكان گلەیی و گازاندەیان لەوە دەكرد كەعێراقیەكان چەك و كەرەستەی جەنگی فەڕەنسایی پەرەسەندوو تریان پێیە لەوەی كە ئەو هێزە فەڕەنساییە پێیەتی كەبەشداری ئەو هاوپەیمانێتیەی كرد و كە (ئەمریكا) سەركردایەتی كرد و عێراقیەكانی لەكوێت دەرپەڕاند.

پەیوەندی بەرچاوانەی نێوان فەڕەنسا و سەدام لەساڵی (١٩٧٤)ەوە دەستی پێكرد، ئەوكاتە سەرەتای (قەیرانی یەكەمی نەوت) بوو، (جاك شیراكی) سەرۆكی ئێستای فەڕەنسا كەئەو كاتە سەرۆك وەزیرانی فەرەنسا بوو، قەواڵەیەكی لەگەڵ بەغدادا مۆركرد كەفەرەنسا كەرەستەی سەرمایەداری بداتە عێراق و قەواڵەكەش بە (قەواڵەی سەدە) ناوزەد كرا، ئەوكاتە شیراك سەدام حسینی بە (دۆستی گەورە) ناودەبرد ، سەدام ئەوكات جێگری سەرۆكی ئەنجومەنی سەركردایەتی شۆڕش بوو، بەڵام بەكردەوە كەسی یەكەم و بەهێزترین دیكتاتۆر بوو لەعێراق.

ساڵی (١٩٧٦) (ئەمریكا) زۆر هەوڵیدا، كە (فەرەنسا) لەوە پاشگەز بكاتەوە، كەمەفاعیلی (ئۆزیراكی ئەزمونگەری) بەعێراق نەفرۆشێ و پێی ڕاگەیاند كەئەم كارە وادەكات بەغداد ببێتە خاوەنی بڕێكی زۆرلە (یۆرانیۆمی پیتێنراو) كەئیتر توانای بەرهەم هێنانی چەكی كۆكوژی هەبێت، بەڵام هەوڵەكانی (ئەمریكا) بێهودە بوو .

ساڵی (١٩٩٦) دادوەرێكی بەریتانی لەڕاپۆرتێكیدا دەگاتە ئەو دەرئەنجامە كە بەریتانیا لەكاتی جەنگی (عێراق – ئێران)دا فرۆشتنی چەكی كۆكوژی بەعێراق قەدەغە كردبوو بەڵام دوای كۆتایی هاتنی جەنگەكە بەنهێنی، ئەو قەدەغە كردنەی سوك كرد و یارمەتی پڕچەك كردنی عێراقیدا.

لەناوەڕاستی (شوباتی ١٩٩٨) لەناو پەرلەمانی بەریتانیادا، قسەو قسەلۆك و یەكتری تاوانبار كردن لەئارادا بوو، سەبارەت بەوەی لەسالانی هەشتاكاندا، بەریتانیا بڕێكی ئێجار زۆر كە زیاترە لەویستی خەستەخانەكانی عێراق، مادەیەك دراوە بەعێراق كەپێی دەڵێن (هۆكارەكانی گەشەكردن) ئەم مادەیە لەدروست كردنی چەكی (بەكتر یۆلۆجی‌دا) بەكار دەهێنرێت. دیبلۆماتەكان دەڵێن: زۆربەی هەرە زۆری ئەو ماددەو كەرەستانەی بۆ دروست كردنی چەكی كیمیایی و بایۆلۆجی بەكاردەهێنرێن لەژێر پەردەی بەكارهێنانی مەدەنی‌دا، (ئەڵمانیا و سویسرا) فرۆشتویانە بەعێراق، تەنانەت دوای ئەوەی كەعێراق لەناوەڕاستی هەشتاكاندا دژی سەربازە ئێرانیەكان و لەساڵی (١٩٨٨) دژی كوردەكان گازی ژەهراوی خەردەلی بەكار هێنا ئەم فرۆشتنە هەر بەردەوام بوو.

ئەندامێكی پێشوی تیمە پشكنەرەكان دەڵێ: (هۆیەكی سەرەكی كەوایكرد لەپشكنەرەكانی نەتەوەیەكگرتووەكان كە بزانن بەدوی چیدا دەگەڕێن، ئەوە بوو كەدەزگا ئیستخباراتیەكانی وڵاتانی ڕۆژئاوا لەناو خۆیاندا ڕێك كەوتبوون كەهاریكاری یەكتری بكەن بەوەی ئەو زانیاریانەی هەیانە سەبارەت بەوەی كە كۆمپانیا ڕۆژ ئاواییەكان چییان فرۆشتووە بەعێراق ، بەیەكتری بڵێن بەڵام بەو مەرجەی ئەم كارە بەنهێنی بكرێ و بەنهێنی بمێنێتەوە ) .

لەكاتێكدا لێپرسراوانی (ئەمریكا و بەریتانیا) (فەڕەنسا) بەوە تاوانبار دەكەن كەبەرژەوەندی‌یە بازرگانیەكانی لەپشت هەوڵەكانیەوەیەتی بۆ هەڵگرتنی سزا ئابوریەكانی سەر عێراق ، بەڵام ڕێكەوتننامەیەكی ڕانەگەیەنراویش لەنێوان هەموویاندا هەیە ، كەلەوانەیە

ئێستا دۆسیەی پەیوەندیەکانی ڕابردوی سەدام و ڕۆژئاوا ئاشکرا نەکرێ ، یەکێك لەلێکۆڵەرەوە ڕۆژئاواییەکان دەڵێ : ( لەوانەیە سەدام بکوژبێ بەڵام بۆماوەیەکی زۆر ئەم کارەی بۆ ئێمە کردووە). حکومەتەکانی وڵاتانی ڕۆژئاوا هاریکارییان لەگەڵ سەدام دا دەشارنەوە.

## چەند ساڵی تر بەعس لە عێراق دا حوکم بکات ؟

بەناوهێنانی بەعس هەموو کەس دەزانێت مەبەستم کێیەو باسیش لە چ سەردەمێك دەکەم و چ دەسەڵاتدارێکیش خاوەنی ئەم ناوە قێزەونەیە و مێژووی پڕیەتی لە چ دڕندایەتییەك ، زۆر گەڕام لەفەرهەنگی ئەم وڵاتەدا وشەیەك لە(بەعس) ناشیرینترم تا ئێستە نەبیستووە .

بەعسیزم وەك ئایدۆلۆجیایەکی کەم وێنە لە دونیای دەسەڵاتدارێتی دا ( زمکان)ێکی زەوەندی بەشوێن خۆیدا کێش کرد ، کەسەراپا بریتی نەبوو لە (بیر) یان (شۆڕش)ێك بۆ وەدەست هێنانی بەختەوەری ئینسانەکانی عێراق ، بەڵکە ئایدۆلۆجیای (بەعس) لە سەر بنەماو ستراتیجی (گەیشتن بە دەسەڵات بۆ لە بەین بردنی نەیارەکانیان پێکهێنرا ) لەوکاتەوە کارایی عونف و دڕندایەتی بەعس بەناخی تاکی عێراقیدا شۆڕدەبێتەوە بەجۆرێك وێنە ناشیرینەکانی (بەعس) لە بونیادی ئەقڵی ناوەوەماندا نەخشاوە .

ڕونتر بڵێم ئەوانەی بەعسیش نەبوون ڕەدفیعلەکانیان دژی بەعس بەعسییانەبووە چونکە ماوەی حوکمی بەعس لە عێراق دا گەیشتووە بە لەناوبردنی جیلێك و لەگەڵیشیدا نەوەیەکی نوێ هاتۆتە بوون ، دەمەوێت بڵێم بۆ داشۆرینی کۆمەڵگای عێراقی بە تەواوی کەمایەتیەکانەوە پێویستمانە وێنەی بەعس لە عەقڵی ناوەوەی تەواوی تاکی عێراقی دا بسوتێنین ، پێم وایە پرۆسەی نەهێشتنی ئاسەواری بەعس لە دیمەنی عێراق دا هێندە گرنگ نیە کە پێویستە لە ناوەڕۆك دا (دیمەنی بەعس) لە کلتوری کۆمەڵایەتیمان دەربهێنین . چونکە زۆرن ئەوانەی دژی بەعس بوون بەڵام مامەڵەی ئێستەیان لە هەرشوێن و کاتێك دا بێت دەچێتە خانەی پێناسینە ناشیرینەکانی کلتوری ڕەشی بەعسیزم ، هەست دەکەم هەوڵی ڕاگرتن و سڕینەوەی عەقڵی فەردی عێراقی بەگشتی لە کارابیەکانی بەعس زۆر کەمەو هەندێك جار ڕۆشنبیرێك یان دووان لێرەو لەوێ باسی دەکەن .

ئێمە هێندەی پێویستمانە کۆمەڵەو ڕێکخراوی زۆر پێك بهێنین و بەشوێن گۆڕی بەکۆمەڵ و تاوانی جینۆسایدی بەعس دا بڕۆین و تەواوی کوردو نەتەوەکانی تر ببزوێنین تا بڕۆنە پێش بۆ دادگایی کردنی سەرانی بەعس لەوەزیاتر پێویستە کۆمەڵەو هەوڵی گرنگ بخەینە جوڵە بەسەرپەرشتی کەسانی پسپۆڕ بۆ وردوخاش کردنی ئەو کاریگەرییە خراپانەی بەعس کەلەناوماندا جێی هێشتووە و بەوێنەی ئەو هەموو چەکە زۆرەن کەعێراقی کردۆتە جەنگەڵستان ، بەڵێ بەعس نەماوەو حوکم ناکات بەڵام نابێت لێگەڕێین عەقڵیەتی بەعس و ئایدۆلۆجیای بەعس پیادە بکرێت بەسەرمان دا لەهەر بوارێکی ژیان دا بێت .

لام وایە نابێت ڕازی بین بەعسیەکانی دوێنێ بەجەستە بێنەوە سەرکار ، جاران بۆ بەعس ئەمڕۆش بۆ حکومەتی نوێی دوای (صدام) چونکە جیاوازی نیە لەنێوان ئەوەی دوێنێ کردویانەو ئەوەشی ئەمڕۆ دەیانەوێت بیکەن و کردویانە .تەنها هێندەجیاوازن کە ئەوە بۆ مادەو (صدام) بووە ئەمیان بۆ (ماددە) یە .

(صدام) بەڵێ تاوانباری یەکەمە لە عێراق دا بەلاَم بینیمان کاتێك تەنها بوو هێندەی (ڕێوی)یەك لەو کونەدا کەتیایدا گیرا بەرگری پێ نەکرا نابێت لێگەڕێین (بەعسیزم) لەعەقڵی فەردی عێراقی دا حوکم بکات ، ناشڵێم ئەمە هەوڵێکە پێویستی بە کات نیە بەڵکو زەمەنیش بەشێکە لە چارەسەر .

ئێمە زۆر ڕقمان هەڵدەسا کاتێك لیباسی بەعسیەکانمان دەبینی و بەو جلو بەرگەوە بۆیان هەبوو زوڵم بکەن و کەسیش نەوێرێت تەماشایان بکات ، بۆیە نابێت ئەمڕۆ لەکەسی تر قبوڵ بکەین بەو جلوبەرگەوە وابزانێت بۆ ئەوە پۆشیویەتی ئەتوانێت شەق لە خەڵکی هەڵبدات بەناهەق و کەسیش بۆی نیە ڕوبەڕوی ببێتەوە .

## ئەی کێ حوکم دەکات ؟

( ئەیاد عەلاوی ) کەماوەی (١٠) ساڵ لە بەعسیەکانی ساڵی (١٩٦١) بووە و (دکتۆرە هیفا عزراوی ) هاوڕێی دەڵێت من چومە کۆلیجی پزیشکی لە بغداد ئەیاد عەلاوی قوتابی بوو من خوێندنم تەواو کرد ئەو هەر قوتابی بوو (سەرۆکی اتحاد طلبە) بوو ئەو بڕوانامەیەشی هەیەتی تەزویرە ، بەلاَم بەدوو ئاراستە باوەڕپێکراوترین کەسی موخابەراتی

بەریتانی و ئەمێریکییە ، ژنێکی مەسیحیەو خۆی شیعە مەزهەبە بەلاّم کابرایەکی تەواو عەلمانیە .

عەلاوی توانی سەر بکەوێت بەسەر مونافیسەکەشیدا کە ئەحمەد چەلەبیەو (٢٢) ساڵ حوکمی زیندانی هەیە لە ئەردەن و تۆمەتبارە بە چەندین کاری فەسادی ئیداری .

ئەوەشی سەرۆکایەتی عێراقی گرتۆتە دەست (غازی عجیل یاوەر)ە و کابرایەکە بەڵێ خاوەنی بڕوانامەی ماستەرە لە ئەندازیاری بیناسازی دا بەلاّم کابرایەکی عەشایەرەو ناسیۆنالستێکی توندڕەوە کەتائێستە ئامادەنەبووە جبەو عەگاڵ دابگرێت و هەر ئالاّکەی بەعسی هەڵکردووە !

ئەو کەسەشی کە نەکراوە بەسەرۆك و قسەی زۆر لەسەر بووە سەردەمانێکی زۆر وەزیری حکومەتی بەعس بووەو کاتێك دەڕواتە کەنداو دەستی ئەمیری ئیمارات ماچ دەکات ....تد

ئەگەر ئەمانەش ببنە جێ ئومێدی خەڵکانی عێراق ، وانازانم لەو ئاستەدابن عێراقی ئاسایش و سەروەری و ئاشتی بتوانن بگێڕنەوە چونکە عێراق لەوە هەڵهاتووە جارێکی دی کەسێك بەتەنها بتوانێت لە بغداوە بڕیار بدات و حوکمی سەرانسەری عێراق بکات . بەبێ ئەوەی یەکپارچەیی خاکی عێراق تێك بدرێت و فیدرالیەت مومارەسە بکرێت تەواوی هەوڵەکانی تر ئەزمونێکی بێ ئاکامە .

## ئەی کورد کێ حوکمی بکات ؟

کورد لەبەر ئەوەنا کە باسم کرد قابیلی ئەوەیە مافی خۆی بەدەست خۆی بخات بەڵکو لەبەر ئەوەی ماڵێکی لێکترازاوو پەرتی هەیەو دوای دروست کردنی حکومەتی نوێی عێراقیش نەیتوانیوە یەکی بخات و موسایەرەی بارودۆخەکەدەکات تا ئەوکاتەی ئەمەشمان لە دەست بچێت

بەخاتری ئەوەی بەشیاومان نازانن ئیدارەی خۆمان بۆبکرێت ئەمەش وەك بارودۆخەکەی باشور جێی ڕەخنەی توندو قبولْ نەکراوە ئەگەرنا چ هەڵوێستێك لەوە لاوازتربێت کە دوای (١٢) ساڵ حوکم بەدەست کورد خۆی بێت بەلاّم تا ئێستە دوولایەنە (سیْ پارێزگا) براوە بەڕێوە دەبێت چیتر گەلی کورد ڕازی نەبێت بەوجۆرە مامەڵە لەگەڵ چارەنوسی بکرێت و ئاڵۆزییەکانی خۆی پیْ چارەسەر نەکراوەو بیْ هەڵوێست خۆی داوەتە دەستی واقیع ، کیْ دەتوانێت لەوە تیْ بگات کە لەعێراق دا هەیەو چاوەڕوانی چیشی لیْ دەکرێت کە هەر شارە حاکمێك و دەسەلاّتێك و دەسەلاّتدارێکی تێدایەو کەسی پەیوەندی بەدەرەوەی خۆی نیەو دەسەلاّتدارەگەورەکانیش هەموو لە بغداد کۆبونەتەوە ... کورد تائێستە چونکە هەڵوێستی دولایەنەو ئیدارەکەی دوو حکومەتە نەیتوانیوە یەکدەنگ پرۆژەی خۆی تەرح بکات و لەسەری داکۆکی بکات بەڵکو هەموو جارێك دەکرێینە جێگری عەرەب و پێشیان وایە زۆرمان بردووە !

## ئەمریکا بۆچی هاتوو چی کردووە ؟

ئەمریکا کاتێك ویستی بێتە عێراق باوەڕی وابوو گۆڕانکاری نەخشەی سیاسی ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاستی پێیەو لە عێراقەوە دەست پێدەکات ، ترس ڕوی لە ئێران و سوریا و ..... زۆر ولاّتی تری دیکتاتۆری عەرەبی کرد بەلاّم لەدواساتەکانی دروست کردنی حکومەتی نوێی عێراقی دا بینیمان بەویست و فشاری ئەردەن و بۆ ڕەزامەندی عەگالاّ بەسەرەکانی کەنداو و ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست سەرلەنویْ کەسانێکی هێنایە پێش کە بەویست و خواست و ڕەزامەندی ئەوان بێت

واته لە عێراق دا ئیمارات و کوەیتێکی تری دروست کردەوەو نوێنەرە ڕاستەوخۆکانی خۆی هێنایەوە پێش من نالێم موقتەدا سەدر یان کەسانێکی هاوشێوەی ئەو بهێنێتە پێش بەڵام ناکرێت عێراقی دوای صدام عێراقی بەعسیە کۆنەکان و ئاژاوەو شەڕ بێت .

دەمانخواست عێراقی دوای صدام بەتەواوی نەمانی بەعس و ئاسەوارەکانی بووایە ، نەك بەوجۆرەبێت کە صدام و زۆرینەی تاوانبارەکانی دەوروبەری لە زیندانا بن و کەس لێیان بەئاگانەمێنێت .

## صدام لە چەند سەر دێڕێك دا

- ٢٨ ی نیسانی ١٩٣٧ لە دێی عوجەی نزیك تکریت لە دایك بووە کە ١٥٠ کیلۆمەتر دورە لە باکوری بەغدای پایتەختەوە ( هەرچەندە زۆر بیروبۆچونی تر هەیە لەسەر ڕۆژو ساڵ و مانگی لەدایك بوونی صدام )
- ئۆکتۆبەری ١٩٥٦ بەشداری کردووە لەو ڕاپەڕینەدا کە دژ بە حوکمی مەلەکی سەر بە بریتانیا .
- ئۆکتۆبەری ١٩٥٩ دوای ساڵێك لە حوکمی مەلەکی بەشداری کرد لە هەوڵی کوشتنی عبدالکریم قاسم دا و هەڵهات بۆ دەرەوەی عێراق .
- فبرایری ١٩٦٣ گەڕایەوە بغداد و کەوتە زیندان و کرا بە جێگری ئەمینداری گشتی حیزبی بەعس .
- یۆلوی ١٩٦٨ بەشداری کرد لە نەخشەداڕشتنی ئەو ئینقیلابەدا بۆ هاتنە سەر حوکمی بەعس بەسەر عبدالرحمن عارف دا .

- مارسی ١٩٧٥ وەك جێگری ئەحمەد حسن بەكر لەگەڵ شای ئێران دا ڕێكەوتنێكی ئیمزاكرد دژ بە گەلی كورد .
- ١٦ ی یۆلیوی ١٩٧٩ صدام هاتە سەر حوكم .
- ٢٢ ی سیبتەمبەر ی ١٩٨٠ لەگەڵ ئێران بۆ ماوەی ٨ ساڵ جەنگی بەرپا كرد .
- ١٦ ی مارسی ١٩٨٨ بەچەكی كیمیاوی پەلاماری شەڕی هەڵەبجەی داو ٥٠٠٠ پێنج هەزار خەڵكی سیڤلی كوشت .
- ٢ ی ئوگوستی ١٩٩٠ پەلاماری كوێتی داو ڕێكخراوەی نەتەوە یەككگرتووەكان سزای ئابووری خستە سەر عێراق .
- ١٧ ی یەنایری ١٩٩١ پەلاماری ئاسمانی هاوپەیمانان بۆ سەر عێراق دەستی پێكرد و لە ٢٨ ی فێبرایردا عێراق لە كوێت وەدەرنرا .
- ١٥ ی ئۆكتۆبەری ١٩٩٥ لە هەڵبژاردنێكی كارتۆنی دا بە بێ مونافیس ٩٩٪ ی بەدەست هێنا !!
- ١٥ی ئۆكتۆبەری ٢٠٠٢ لە هەڵبژارنێكی كارتۆنی تردا صدام ١٠٠ ٪ ی دەنگەكانی هێنا !!

# گرنگترین ڕوداوەكانی عێراق

* (٢)ی حوزەیرانی (١٩٢٠) شۆڕش دژی حوكمی سەربازی بەریتانیا لەعێراقدا هەڵگیرسا.

* (٢٤)ی تەموزی (١٩٢٠) هێزی فەڕەنسی فەیسەڵی لاداو دیمەشقی داگیركرد .

* (٢٧)ی ئـابی (١٩٢١) بەریتانیـەکان موسـڵیان ئاراسـتەکرد بـۆ موڵکداری عێراق.

* (١٠)ی تشرینی یەکەمی (١٩٢٢) ئیمزای پـەیمان نامـەی (الانجلوا عراقیه) کرا، بەپێی ئەو پەیماننامەیە بریتانیا بەفراوانتر بۆی هەیـە بێتـە عیراقەوە.

* (١٦)ی تشـرینی دووەم (١٩٢٢) عـیراق پەیماننامـەی (الانجلـو عێراق)ی پەسەند کرد.

* (٣)ی تشرینی یەکەمی (١٩٢٢) عێراق قبوڵ کـرا سـەربەخۆبێت لـە (عصبة الأمم المتحدة)دا.

* (١٣)ی کانونی یەکەمی (١٩٣٢) یەکەم بەیاننامەی حیزبی شیوعی کە (فهد) نوسیبوی بڵاوکرایەوە.

* ئابی (١٩٣٣) لیواو ( بکر صدقی ) پەلاماری ئاشوریەکانیدا.

* (٨) ئـەیلولی (١٩٣٣) مـەلیك فەیسـەڵ مرد، غـازی کـوڕی لـەجێی خۆی دانا.

* (٢٨)ی نیسان (١٩٣٧) سەدام لەدایك بوو.

* (١١)ی ئابی (١٩٣٧) کۆمـەڵێك ئەفسـەری (ضباط) (بکر صدیق ) یان کوشت.

* (١)ی نیسـانی (١٩٤١) چـوار لەجەنەڕاڵـە دفـاع وطـني سـەربازیە نەتەوەییەکان حاڵەتی نائاساییان ڕاگەیاند و حکومـەتی () یـان دروسـت کـرد. بەسـەرۆکایەتی (رشـید عـالی گـەیلانی)، سیاسـیە پشـگیرەکانی بەریتانیاش هەڵهاتن.

* ئایاری (١٩٤١) شەڕ لەشاری بەسرە لە نێوان سوپای عێراق و بەریتانیادا ڕویدا کەلە (١٩)ی ئایاردا سوپای عێراقی شکاو رشید عالی و جەنەراڵەکان ڕایانکرد بۆ تاران.

* ١ی حوزەیرانی (١٩٤١) کوژرانی ژمارەیەکی زۆر لە یەهودیە عێراقیەکان ٢٤ی تەموزی (١٩٤٣) یەکەم بەیان لەلایەن کۆمەڵێکەوە دەرکرا سەبارەت بەکوشتنی (١٠) کەس ئەو کۆمەڵەش (البعث العربیە) بوون لەدیمەشق وەك سەرەتای خۆدەرخستن ئەو کارەیان ئەنجام دا.

* نیسانی (١٩٤٧) یەکەم کۆنگرەی حیزبی بەعس سازدرا.

* ٢٠-٢٧ی کانونی دووەمی (١٩٤٨) خۆپیشاندانی جەماوەری و ناڕەزایی جەماوەری دژی پەیماننامەی (بورتسمات) ئەنجام درا کەلەگەڵ بەریتانیادا سازکرا بوو.

* ١٤-١٥ شەبات (١٩٤٩) فهدو دوهاوڕێی تری لەسێدارە دران لەسەرکردەکانی حیزبی سیوعی.

* ١٤ی تەموزی (١٩٥٨) عبدالکریم قاسم ئینقیلابی کردو هاتە سەرحوکم.

* ٢٤ی تەموزی (١٩٥٨) میشل عەفلەق هات بۆ بغداد، بۆ ئەوەی یەککگرتن لەگەڵ سوریا و میریدا ئەنجام بدات.

* ٣٠ی ئەیلولی (١٩٥٨) عبدالسلام عارف لەهەموو پۆستێکی حکومی بەخشرا، کە جێگری سەرۆك وەزیران و وەزیری داخلی بوو، چونکە هەستا بوو بەبەشداری کردنی هەوڵی کوشتنی (عبدالکریم قاسم).

* ئازاری (١٩٥٩) کۆمەڵێ (ضباط)ی قەومی لە موسڵ جیابونەوە دژی عبدالکریم قاسم.

* ١ی ئایاری (١٩٥٩)شیوعیە کوردەکان لەکەرکوك دەستیان کرد بە کوشتنی تورکمان و عبدالکریم قاسم دەستی کرد بەشەڕ لەگەڵ شیوعیەکاندا کەتا مانگی ئابی خایاند.

* ئەیلولی (١٩٥٩)نوسراوەکانی میشل عەفلەق بۆیەکەمجار کۆکرایەوەوبەناوی (فی سبیل البعث) ەوە بڵاو کرانەوە.

* ٧ی تشرینی یەکەمی (١٩٥٩) عبدالکریم قاسم لەوهەوڵی کوشتن ڕزگار بوو کەکۆمەڵێك بەعسی لە شەقامی (رشید) ئەنجامیان دا ، سەدام هەڵهات بۆ سوریا پاشان چووە میسر. (٧) ئەندامی بەعسی تیادرابە دادگا.

* ١ی کانونی دووەمی (١٩٦٠) عبدالکریم قاسم ڕایگەیاند بە هەموو لایەك ئازادە پارتی سیاسی دروست بکات بێجگە لە حیزبی شیوعی.

* ئەیلولی (١٩٦١) سوپای عێراق دەستی بەهێرش کردن بۆ سەر کوردەکان کرد.

* ٢٤ی یەکەمی (١٩٦٢) بەعس توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێ لە ڕێکخستنەکانی شاردا لەناو خوێندنگاو شوێنە جیاوازەکاندا.

* ٨ی شوبات (١٩٦٣) کودەتای بەعسیەکان دژ بە عبدالکریم قاسم ئەنجام درا.

* شوباتی (١٩٦٤) میشل عەفلەق (صدام)ی سەرخست بۆ سەرۆکایەتی حیزبی بەعس لقی عێراق.

* ١٨ نیسان- ٦ی ئابی (١٩٦٦) عبدالرحمن بزاز بوبە سەرۆك وەزیران.

* حوزەیرانی (١٩٦٧) شەڕی (الایام الستە) ڕویدا کە جیهانی عەرەبی توشی کێشە کرد.

* ١٧ی ئەیلەلی (١٩٦٧) حیزب شیوعی عێراقی بوو بە دووبەشەوە.

* ١٧ی ئـــەیلولی (١٩٦٧) ئەفســـــەرە پلـــەدارەکانی بـــەعس هاوپـەیمانێتیان لەگـەڵ کۆمـەڵێك ئەفسـەری تری غـەیری بەعسیدا کردو ئینقیلابە سەرکەوتووەکەیان بەسەر عبدالسلام عارف دا ئەنجام دا.

* ٣٠ی تـەموزی (١٩٦٨) ئەحمـەد حەسـەن بـەکر بـوو بەفەرمانـدەی (ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) کەپێشتر ئەمینداری گشتی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی بوو، هـەروەها کرابە سـەرۆکی گشـتی سوپا، (صدام)یش کەیاریدەری ئەمینداری گشتی حیزبی بـەعس بو، کرا بە جێگری (ئەنجوومـەنی سـەرکردایەتی شـۆڕش) و بەرپرسـی ئاسایشـی ناوخۆ.

* شوباتی (١٩٦٩) علی عزیز حاجی سکرتێری (القیادە المرکزیە)ی حیزبی شیوعی گیرا.

* ٨ی ئابی (١٩٦٩) گونـدی (داکان) کەسـەربە موصل بـوو لەلایـەن سوپاوە بەدڕندانە ترین شێوە پەلامادار.

* تشـرینی یەکـەم (١٩٦٩) عبـدالرحمان بـەزاز ئەشـکەنجەی زۆر درا کە سەرۆك وەزیرانی پێشو بوو بەبیانوی ئەوەی سەربەسەهێونیەتە.

* ١٤ی تشـرینی دووەمـی (١٩٦٩) تەلـەفیزیۆنی عێراقـی کۆمـەڵێ جولەکەی عێراقی نیشاندا کەلە بەسرە گیرا بـوو بەتۆمـەتی جاسوسـی کردن بۆ ئیسرائیل.

* ٥ی کـانونی دووەمـی (١٩٦٩) لەدادگایـەکی ئاشـکرا داحـوکمی (٣٠) کـەس درا گوایـە جولەکـەی عێـراقین و جاسوسـیان بـۆ ئیسـرائیل کردووە و هەموویان لە سێدارە دران لەپێش چاوی خەڵك.

* ٢١ی کانونی دووەمی (١٩٧٠) پیلانێکی نوێ هەڵوەشێنرایەوە لە هەفتەیەکدا (٤٤) کەسیان لە سێدارە دران.

* ١٠ی تەموزی (١٩٧٠) حیزبی بەعس مەرجەکانی ئاشکرا کرد بۆ قبوڵ بونی ئەوەی حیزبی شیوعی بچێتە پاڵ عێراق و (جبهە الوطنیة) دروست بکات.

* ئابی (١٩٧١) عبدالکریم نصرت کەلە بەعسیەکۆنەکان بوو لەماڵی خۆیدا کوژرا.

* ئەیلولی (١٩٧١) هەوڵی کوشتنی مەلا مستەفا سەری نەگرت.

* تشرینی دوومی (١٩٧١) فوئاد رکابی کەسەرکردەیەکی بەعسی بوو لە سجندا کوشتیان.

* نیسانی (١٩٧٢) پەیماننامەی دۆستایەتی (عێراق- سۆڤێت) ڕاگەێنرا.

* ئابی (١٩٧٢) شیوعیەکان هاتنە باوەشی عێراقی بەعسی.

* حوزەیرانی (١٩٧٣) (ناظم کزار) ی سەرۆکی ئاسایشی ناوخۆی عێراق لەسێدارەدرا، چونکە لەگەڵ (٣٥) کەسی ترا هەوڵی گۆڕینی سیستەمی حوکمی عێراقیان دابوو.

* تەموزی (١٩٧٣) ئیمزای (میثاق العمل الوطنی) کرا.

* کانونی دووەمی (١٩٧٤) کۆنگرەی هەشتەمی حیزبی بەعس سازکرا.

* ئازاری (١٩٧٤) جارێکی تر شەڕدژ بەکورد هەڵگیرساوە کە ئاشبەتاڵ کرا.

* ٦ی ئازاری (١٩٧٥) تەواو بونی پەیماننامەی جەزائیر کەلە نێوان بەعس و شای ئێران دا ، کە عێراق تەواو ملکەچی هەموو داواکاریەکانی شابێت بەمەرجێ شای ئێران دژی کورد بوەستێ .

* شوباتی (١٩٧٧) زانایانی شیعە لە (کربلاو) بەبۆنەی عاشوراوە خۆپشاندانیان کرد، تیایدا (١٠٠) کەسی گیراو (٨) زانای شیعەیش لەسێدارە درا.

* تشرینی یەکەمی (١٩٧٨) خومەینی لە عێراق دەرکرا.

* شوباتی (١٩٧٩) شۆڕشی ئیسلامی ئێرانی دەستی پێکرد.

* حوزەیرانی (١٩٧٩) (صدام حسین ) بوبە سەرۆکی کۆمار و احمد حسن بکر لەهەموو شتێ دور خرایەوە.

* تەموزی (١٩٧٩) پاکتاوی بەکۆمەڵی سەرکردە بەعسیەکان بوو، سێ بەش لە ئەندامانی (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی لەسێدارە دا.

* ٩ی نیسانی (١٩٨٠) محمد باقر صدر لەسێدارەدرا، لەگەڵ خوشك و کچەکەیدا .

* ٢٢ی ئەیلولی (١٩٨٠) (صدام) پەلاماری ئێرانیدا .

* ٨ی ئابی (١٩٨٨) جەنگی ئێران– عێراق ڕاگیرا .

* ئازاری (١٩٨٨) کیمیایی بارانی شاری هەڵەبجەی کرد کە (٥٠٠٠) کەسی تیا شەهید بوو ، هەر لەو ساڵەدا (١٨٢) هەزار کوردی ئەنفال کردو (٥) هەزار دێهاتی وێران کرد .

* ٢ی ئابی (١٩٩٠) پەلاماری کوێتیدا .

* ئازاری (١٩٩١) ڕاپەڕینی باکور دەستی پێکرد و ناوچەیەکی زۆری کوردستان ئازاد کرا .

* ٢ی نیسانی (١٩٩١) خەڵکی کوردستان ئاوارەی ئێران و وڵاتانی دراوسێ بوون.

# ناوی ئەو زانا ئاینیە شیعانەی کە صدام کوشتوونی

| الاسم | المدينة | السنة | الدراسة | طريقة الاغتيال |
|---|---|---|---|---|
| آية الله العظمى الشيخ ميرزا علي الغروي | النجف الاشرف | 1998 | مرجع ديني | اغتيال بين كربلاء والنجف |
| آية الله الشيخ مرتضى البروجردي | النجف الاشرف | 1998 | مجتهد واستاذ في الحوزة العلمية | اغتيال في الشارع العام في النجف |
| حجة الاسلام السيد محمد تقي الخوئي | النجف الاشرف | 1994 | عالم دين | قتل في حادث سير مدبر بين كربلاء والنجف |
| حجة الاسلام السيد أمين الخلخالي | النجف الاشرف | 1994 | طالب في الحوزة العلمية | قتل في حادث سير مدبر بين كربلاء والنجف |
| حجة الاسلام الشيخ محمد القوجاني | النجف الاشرف | 1989 | طالب في الحوزة العلمية | اعتقل ولازال مجهول المصير |
| العلامة السيد مهدي الحكيم | لنـــــدن | 1988 | عـــالـــم ديـــن | اغتيال في هيلتون الخرطوم |
| السيد عبد الغني الجزائري | حيرة - نجف | 1988 | خطيب وواعظ | سم بالثاليـــوم |
| الشيخ محمد علي الايرواني | كوفة - نجف | 1988 | خطيب وواعظ | اعتقل من قبل سلطات الامن ووجد مقتولاً |
| السيد محمد الزاملي | كوفة - نجف | 1988 | خطيب وواعظ | اعتقل ولازال مجهول المصير |
| الشيخ علي العبادي | ميســـان | 1988 | عالـــم ديـــن | سم بالثاليـــوم |
| الشيخ عبد الامير الخويلدي | الحـــلـــة | 1988 | عالـــم ديـــن | سم بالثاليـــوم |
| السيد عبد الرضا الصافي | كربـــلاء | 1987 | عالـــم ديـــن | قتل من قبل سلطات الامن |
| حجةالاسلام والمسلمين | النجف | 1986 | عالـــم | سم بالثاليـــوم |

| حجة الاسلام الشيخ محمد البشيري | كركـــوك | 1979 | عالـــم ديـــن | قتل من قبل سلطات الامن |
|---|---|---|---|---|
| الفاضل الشيخ عباس التركماني | كركـــوك | 1979 | خطيب وواعظ | قتل من قبل سلطات الامن |
| الشيخ جابر النعماني | النعمانيـــة | 1979 | عالـــم ديـــن | اعدم من قبل محكمة امن الثورة |
| الشيخ عبد الحكيم النعماني | النعمانيـــة | 1979 | عالـــم ديـــن | اعدم من قبل محكمة امن الثورة |
| حجة الاسلام الشيخ عبد الخالق العوادي | النجف الاشرف | 1979 | عالـــم ديـــن | اعدم من قبل محكمة امن الثورة |
| حجة الاسلام الشيخ عبد العظيم الاسدي | جميلة - بغداد | 1979 | عالـــم ديـــن | قتل من قبل سلطات الامن |
| حجة الاسلام الشيخ محمد حسن الكعبي | ثورة - بغداد | 1979 | طالب في الحوزة العلمية | اعدم من قبل محكمة امن الثورة |
| حجة الاسلام الشيخ مسلم محمد علي الجابري | الفهود - ناصرية | 1979 | عالـــم ديـــن | قتل من قبل سلطات الامن |
| حجة الاسلام السيد جواد الحلو | المشخاب - نجف | 1979 | عالـــم ديـــن | سم بالثاليـــوم |
| حجة الاسلام الشيخ ناظم البصري | كرادة - بغداد | 1979 | عالـــم ديـــن | اعدم من قبل محكمة امن الثورة |
| حجة الاسلام والمسلمين الشيخ عبد الجبار البصري | السلام - بغداد | 1979 | عالـــم ديـــن | اعدم من قبل محكمة امن الثورة |
| آية الله السيد قاسم المبرقع | ثورة - بغداد | 1979 | عالـــم ديـــن | اعدم من قبل محكمة امن الثورة |
| حجة الاسلام والمسلمين السيد محمد رضا محمد حسين الحكيم | النجف الاشرف | 1985 | استاذ في الحوزة العلمية | اعدم في مديرية الامن العامة |
| حجة الاسلام والمسلمين الدكتور السيد د. عبد الهادي محسن الحكيم | النجف الاشرف | 1985 | عالـــم ديـــن | اعدم في مديرية الامن العامة |

| حجة الاسلام السيد عبد الصاحب محمد حسين الحكيم | النجف الاشرف | 1985 | استاذ في الحوزة العلمية | اعدم في مديرية الامن العامة |
|---|---|---|---|---|
| حجة الاسلام السيد محمد حسن محمد علي الحكيم | النجف الاشرف | 1985 | استاذ في الحوزة العلمية | زرق بحقنة سامة |
| حجة الاسلام السيد حسن عبد الهادي الحكيم | النجف الاشرف | 1985 | طالب في الحوزة العلمية | اعدم في مديرية الامن العامة |
| آية الله السيد عبد المجيد محمود الحكيم | النجف الاشرف | 1985 | استاذ في الحوزة العلمية | اعدم في مديرية الامن العامة |
| حجة الاسلام والمسلمين الشيخ ماجد البدراوي | كوفة - نجف | 1985 | عالم دين | اعدم في مديرية الامن العامة |
| آية الله السيد نصر الله المستنبط | النجف الاشرف | 1985 | مرجع ديني | زرق بأبرة سامة في بيته |
| حجة الاسلام الشيخ عباس المطراوي | القاسم - ديوانية | 1985 | استاذ في الحوزة العلمية | اعتقل ولازال مجهول المصير |
| حجة الاسلام الشيخ علي قبلة | النجف الاشرف | 1985 | استاذ في الحوزة العلمية | اعتقل ولازال مجهول المصير |
| حجة الاسلام الشيخ عزيز العماري | النجف الاشرف | 1985 | طالب في الحوزة العلمية | اعدم من قبل سلطات الامن |
| الشيخ حميد الكوتاوي | الكوت | 1985 | طالب في الحوزة العلمية | اعتقل ولازال مجهول المصير |
| السيد عصام شبر | البصرة | 1984 | عالم دين | اغتيال بين كربلاء والنجف |
| حجة الاسلام الشيخ محمد يونس الاسدي | البياع - بغداد | 1984 | عالم دين | اعدم من قبل سلطات الامن |
| حجة الاسلام حسين جودة | غماس- ديوانية | 1984 | عالم دين | توفي تحت التعذيب |
| السيد نور محمد البلخي | النجف الاشرف | 1984 | عالم دين | اعدم من قبل محكمة امن الثورة |
| السيد نور محمد البلخي | النجف | 1984 | عالم | اعدم من قبل |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | الاشرف | | ديـــن | محكمة امن الثورة |
| الشيخ جبار فرج الله | النجف الاشرف | 1984 | طالب في الحوزة العلمية | اعدم من قبل محكمة امن الثورة |
| الشيخ صلاح الساعدي | كـربـــلاء | 1984 | طالب في الحوزة العلمية | اعتقل ولازال مجهول المصير |
| السيد باقر عبد الصاحب الموسوي | النجف الاشرف | 1984 | طالب في الحوزة العلمية | توفي تحت التعذيب عمره ١٤ سنة |
| حجة الاسلام الشيخ عبد الجليل مال الله | بعقوبـــة | 1980 | عالـــم ديـــن | توفي اثناء القبض عليه |
| حجة الاسلام الشيخ حسن البهادلي | ميســـان | 1980 | عالـــم ديـــن | توفي تحت التعذيب |
| حجة الاسلام الشيخ عبد الامير الساعدي | طويريج - كربلاء | 1980 | عالـــم ديـــن | زرق بحقنة سامة |
| حجة الاسلام الشيخ عبد المنعم الساعدي | ميســـان | 1980 | عالـــم ديـــن | اعدم من قبل محكمة امن الثورة |
| حجة الاسلام الشيخ شريف الجابري | النجف الاشرف | 1980 | عالـــم ديـــن | اعدم من قبل محكمة امن الثورة |
| حجة الاسلام السيد زين العابدين الموسوي | الكفل - الحلة | 1980 | عالـــم ديـــن | اعدم من قبل محكمة امن الثورة |
| السيد زيد الموسوي | الكفل - الحلة | 1980 | عالـــم ديـــن | اعدم من قبل محكمة امن الثورة |
| الشيخ فرحان البغدادي | كاظمية - بغداد | 1980 | طالب في الحوزة العلمية | اعدم من قبل محكمة امن الثورة |
| الشيخ ناظم النجفي | النجف الاشرف | 1980 | عالـــم ديـــن | اعدم في مديرية الامن العامة |
| السيد محمد صادق البطاط | الكفل - الحلة | 1980 | طالب في الحوزة العلمية | اعدم في مديرية الامن العامة |
| حجة الاسلام الشيخ | البياع - | 1980 | عالـــم | اعدم في مديرية |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| قاسم هادي ضيف | بغداد | | ديـن | الامن العامة |
| الشيخ صالح هادي الحسناوي | دواية - ناصرية | 1980 | خطيب وواعظ | اعدم في مديرية الامن العامة |
| الشيخ محمد اليوسفي | النجف الاشرف | 1980 | عالـم ديـن | اعدم من قبل محكمة امن الثورة |
| آية الله الشيخ محمد تقي الجواهري | النجف الاشرف | 1980 | مجتهد واستاذ في الحوزة العلمية | اعتقل ولازال مجهول المصير |
| الشيخ محمد الدماوندي | النجف الاشرف | 1980 | طالب في الحوزة العلمية | اعتقل ولازال مجهول المصير |
| الشيخ عبد الرزاق احمد الجواهري | كـربـلاء | 1980 | عالـم ديـن | قتل من قبل سلطات الامن |
| الشيخ عبد الحسين حبيب الله الحائري | كـربـلاء | 1980 | عالـم ديـن | اعدم في مديرية الامن العامة |
| الشيخ عبد الخالق عماش الهدني | بغـداد | 1979 | عالـم ديـن | اعدم من قبل محكمة امن الثورة |
| الشيخ صادق الاسدي | بـغـداد | 1979 | عالـم ديـن | اعدم في مديرية الامن العامة |
| آية الله السيد مهدي القزويني | كـربـلاء | 1982 | عالـم ديـن | اعتقل ولازال مجهول المصير |
| حجة الاسلام الشيخ ايوب البهادلي | ميسـان | 1982 | عالـم ديـن | اعدم في مديرية الامن العامة |
| حجة الاسلام الخطيب السيد عبد المطلب ابو الريحة | النجف الاشرف | 1982 | خطيب وواعظ | سم بالثاليـوم |
| حجة الاسلام الشيخ علي عزيز حسين | كاظمية - بغداد | 1981 | طالب في الحوزة العلمية | اعدم في مديرية الامن العامة |
| حجة الاسلام السيد هادي القمي | النجف الاشرف | 1981 | طالب في الحوزة العلمية | اعتقل ولازال مجهول المصير |
| حجة الاسلام والمسلمين السيد محمد الطبطبائي | كـربـلاء | 1981 | عالـم ديـن | اعتقل وحكم عليه بالمؤبد |
| الشيخ نثار حسين | النجف | 1981 | طالب في | اعتقل ولازال |

| الكشميري | الاشرف | | الحوزة العلمية | مجهول المصير |
|---|---|---|---|---|
| حجة الاسلام الشيخ مهدي البشيري | طوز - كركوك | 1981 | عالم دين | قتل من قبل سلطات الامن |
| حجة الاسلام الشيخ جليل ابراهيم | طوز - كركوك | 1981 | عالم دين | قتل من قبل سلطات الامن |
| الشيخ احمد الانصاري | النجف الاشرف | 1981 | عالم دين | اعتقل ولازال مجهول المصير |
| حجة الاسلام الشيخ عباس البهبهاني | النجف الاشرف | 1981 | طالب في الحوزة العلمية | اعتقل ولازال مجهول المصير |
| آية الله العظمى السيد محمد باقر الصدر | النجف الاشرف | 1980 | مرجع ديني | اعدم في مديرية الامن العامة |
| الشيخ علي اكبر هاشميان | النجف الاشرف | 1980 | عالم دين | اعتقل ولازال مجهول المصير |
| الشيخ صالح الرفاعي | النجف الاشرف | 1980 | عالم دين | اعدم في مديرية الامن العامة |
| الشيخ صادق حسن اليعقوبي | بغداد | 1980 | عالم دين | اعدم في مديرية الامن العامة |
| الشيخ سالم البغدادي | كاظمية - بغداد | 1980 | خطيب وواعظ | اعدم في مديرية الامن العامة |
| حجة الاسلام والمسلمين السيد حسن الشيرازي | بيروت | 1980 | عالم دين | اغتيل في بيروت |
| آية الله السيد محمد طاهر الحيدري | بغداد | 1980 | عالم دين | سم بالثاليوم |
| حجة الاسلام والمسلمين الشيخ حسين معن | النجف الاشرف | 1980 | عالم دين | توفي تحت التعذيب |
| حجة الاسلام السيد عبد الباقي الموسوي | النجف الاشرف | 1984 | طالب في الحوزة العلمية | توفي تحت التعذيب عمره ١٧ سنة |
| آية الله السيد عبد الصاحب محسن الحكيم | النجف الاشرف | 1983 | مجتهد واستاذ في الحوزة العلمية | اعدم في مديرية الامن العامة |
| حجة الاسلام والمسلمين السيد كمال الدين يوسف الحكيم | النجف الاشرف | 1983 | استاذ في الحوزة العلمية | اعدم في مديرية الامن العامة |
| حجة الاسلام والمسلمين | النجف | 1983 | استاذ في | اعدم في مديرية |

| الشيخ جاسم الكعبي | النجف الاشرف | 1982 | طالب في الحوزة العلمية | اعتقل ولازال مجهول المصير |
|---|---|---|---|---|
| السيد ضياء الدين الهاشمي | النجف الاشرف | 1982 | عالـــم ديـــن | اعدم في مديرية الامن العامة |
| حجة الاسلام والمسلمين الشيخ مهدي السماوي | السماوة | 1979 | عالـــم ديـــن | اعدم من قبل محكمة امن الثورة |
| آية الله السيد قاسم شبر | النعمانية | 1979 | عالـــم ديـــن | اعدم من قبل محكمة امن الثورة |
| الاستاذ السيد طاهر ابو رغيف | البصرة | 1977 | عالـم ديــن | حادث سير مدبر في البصرة |
| حجة الاسلام والمسلمين السيد عز الدين القبانجي | النجف الاشرف | 1974 | طالب في الحوزة العلمية | اعدم من قبل محكمة امن الثورة |
| حجة الاسلام السيد عماد الدين الطباطبائي | النجف الاشرف | 1974 | طالب في الحوزة العلمية | اعدم من قبل محكمة امن الثورة |
| حجة الاسلام والمسلمين الشيخ عارف البصري | كرادة - بغداد | 1974 | عالـــم ديـــن | اعدم من قبل محكمة امن الثورة |
| حجة الاسلام الخطيب الشيخ عبد الزهراء الكعبي | كـربـــلاء | 1972 | خطيب وواعظ | سم بالثاليـــوم |
| الشيخ احمد فرج البهادلي | النجف الاشرف | 1971 | عالـــم ديـــن | سم بالثاليـــوم |
| السيد محمد حسن الحائري | النجف الاشرف | 1970 | طالب في الحوزة العلمية | سم بالثاليـــوم |
| آية الله السيد محمد تقي الجلالي | القاسم - ديوانية | 1982 | الحوزة العلمية | محكمة امن الثورة |
| حجة الاسلام السيد صابر الشرع | النجف الاشرف | 1982 | طالب في الحوزة العلمية | اعتقل ولازال مجهول المصير |
| حجة الاسلام السيد جواد الخرسان | النجف الاشرف | 1982 | طالب في الحوزة العلمية | اعتقل ولازال مجهول المصي |

## سەرچاوەو پەراوێزەکان


١) گۆڤاری ( المجتمع ) ژمارە ١٢٨٨-١٩٩٨/٢/١٧ز .

٢) گۆڤاری المشاهد السیاسی سنة الثالثة العدد ١٠٢ February 1998

٣) گۆڤاری ( الوطن العربی ) العدد ١٠٩٨- ١٩٩٨/٣/٢٠ .

٤) گۆڤاری ( الثقافة الجدیدة ) ژمارە ٢٤٩.

٥) محمد حسین هیکل- حرب الخلیج اوهام القوه والنصر.

٦) ڕێگای کوردستان ژمارە (٢٩٤)- ١٩٩٨/٣/٢٥- ڕاپۆرتی ئاژانسی ڕۆیتەر (١٩٩٨/٢/١٩) لەلایەن ( پول تیکەرەوە ) .

٧) جمهوریة الخوف عراق صدام – سمیر الخلیل – ١٩٩١ .

٨) نواطیر الغرب – ١٩٩٢ – حسن السعید – صفحات من ملف علاقة اللعبة الدولیة مع البعث العراقي ١٩٤٨-١٩٦٨ .

٩) الفضائیة العربیة – ٢٠٠٣ .

١٠) ڕۆژنامەی بزوتنەوەی ئیسلامی ژمارە – ١٩-٢١ -١٩٩٨.

١١) اسرار ماوراء بقاء صدام في الحكم – گیل شیهی ١٩٩١ .

١٢) صدام حسین مناضلا ومفكرا وانسانا – الدكتور امیر اسكندر ١٩٨٠ .

١٣) گۆڤاری سیاسەی دەولی – چەند ژمارەیەك .

١٤) مجلة النفیر – العدد ٦ اب ١٩٩٠

١٥) موقع http://www.freeiraq.freeserve.co.uk/archive1.htm

١٦) الشرق الاوسط ٦ اوكتوبر ٢٠٠١

١٧) من هو صدام التكریتی ؟

١٨) موقع اسلان اون لاين www.islamonline.com

١٩) گۆڤارى جەماوەر – ژمارە ٨٤-٨٥( ١٩٩٩) تۆرِى جاڵجاڵۆكە – توسينى ئالان فريدمان – و: ئەمبرى حاجى

٢٠) د. علي الوردي: لمحات اجتماعية من تارخ العراق الحديث: ج٥ القسم الاول، ص٢٠٩-٢٦٠ ، ومعلومات ومشاهدات في الثورة العراقية الكبرى، ١٩٢٠م. السيد محمد علي كمال الدين، ص٢٧٢،٢٢٨ و٣٨٤، وتاريخ العراق السياسي الحديث: السيد عبد الرزاق الحسني ج١ ص١٨٣. : ج٥، ص٥٥-٣٣١

٢١) عبد الحميد العلوجي : دليل الجمهورية العراقية لسنة ١٩٦٠م ، ص٢٢١ ، وحكومات بغداد : ،ص٢٦ ، والاعلام الزركلي : ج٤ ص٩٢ والبغداديون اخبارهم وجالسهم: ابراهيم الدروبي : ص١٠.

٢٢) كوركيس عواد : ومعجم المؤلفين : ، ج٢ ص٥٠٧.

٢٣) الزركلي : الاعلام : ج٥ ص٣٠١ ، : ج٥ ص٣٧٢ ودليل العراق الرسمي لسنة ١٩٣٦، ودليل الجمهورية العراقية لسنة ١٩٦٠م ص٢٣٠.

٢٤) عبد الرزاق الهلالي: معجم العراق : ج١ ص٢٥.

٢٥) دليل الجمهورية العراقية لسنة ١٩٦٠ ص ١٣ .

٢٦) ليث عبدالحسن : ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ في العراق : ص ٣٧١-٤٠٣ ، ص ٤٠١-٤٢٦

٢٧) موقع مفكرة الاسلام www.islammemo.cc

٢٨) موقع موسوعة النهرين

٢٩) المتحف البريطانى– وثيقة ١/٨ الملف ٢٢٥/الدرج L/٣٣٦

# ئالآكانى عێراق




ئالآى مەلەكى عێراق ساڵى ١٩٢١




ئالآى كۆمارى عێراق ساڵى ١٩٥٨



**ئالأی بەعس کەلە یەکگرتنی عێراق و میصر و سوریاوە پێکهات ساڵی ١٩٥٨**




**ئالأی بەعس کە صدام لە ساڵی ١٩٩١ دا (الله اكبر) ی بۆزیاد کرد**

## دروشمەکانی عێراق لەدوای ساڵی ۱۹۲۰ ز



یەکەم دروشمی دەوڵەتی عێراق لەدوای ساڵی ۱۹۲۰ ەوە




یەکەم دروشمی کۆماریی دەوڵەتی عێراق ۱۹۵۸




شعار الجمهورية العراقية

دروشمی کۆماریی عێراق ۱۹۵۸ کەدواتر صدام الله اکبریشی بۆ زیاد کرد

صدام بەگەنجی





صدام و بەرزانی زڕ برای

صدام لەمیصر



الأسماء الخالدة للرئيس القائد صدام حسين




شەجەرە دروستکراوەکەی بنەچەی صدام



صدام لەمۆسکۆ تاجە گوڵینە دەخاتە سەر گۆڕی لینین



چەند وێنەیەکی ئەشکەنجەدان بەدەستی بەعسیەکانی صدام



وێنەی ئێسکی کۆکراوەی یەکێك لە گۆڕە بەکۆمەڵەکانی ناو عێراق



ڕوخاندنی پەیکەرەکانی صدام دوای ڕزگارکردنی بەغداد



ئەمە یەکێکە لەوپەیکەرانەی صدامی دیکتاتۆر کە بەدەستی جەماوەری دڵ پڕ لە قین خراوەتە خوارو بەچەکوش کەللەسەری صدام دەکوتنەوە



دەسەلاّتدارانی عێراق



دەسەلاّتدارانی عێراق



دەسەلاّتدارانی عێراق



دەسەلاّتدارانی عێراق



جنرال ستانلی مود



ئەوکەسەی لەپشت سیر برسی کوکس وەبوو



دەسەلاّتدارانی عێراق



دەسەلاّتدارانی عێراق






**جەنازەی عودەو قوصەی دوو کوڕە زاڵم و فاسیدەکەی صدام**









**پلاتینەکەی قاچی عودەی**




ئەو خانووەی کە عودەو قوصەی تیا بەسزا گەیەنرا




ئەو خانووەی کە صدامی تیا دەستگیر کرا



صدام بەبێهۆشی لەساتی گرتنی دا






ئەو کونەی کە صدامی تیا دەستگیر کرا




وێنەی صدام دوای دەستگیر کردنی



یەکەم دیمەنی هەواڵی دەستگیر کردنی صدام



یەکەم دیمەنی صدام دوای ڕیش تاشینی لە زیندان دا



صدام ڕۆژێك دوای دەستگیر کردنی



صدام لەیەکێك لە کۆشکەکانی دا بەدەستگیر کراوی





صدام له ناو زيندان دا  كاتێك چەند ئەندامێكی ئەنجومەنی حوكم سەردانیان كرد ئەوەی لەوێنەكەدا دەركەوتووە ئەحمەد چەلەبییە



صدام له وكاتەدا كەبەرەو هۆڵی دادگا پەلكێش دەكرێت



صدام ئەوکاتەی بەرو هۆڵی دادگا دەهێنرێت و
زنجیرەکانی لە دەست و قاچ دەکرێتەوە .



صدام لەناو قەفەسی دادگادا




صدام لەوکاتەدا کە تاوانەکانی ڕووبەڕو دەکرێتەوە



ئەو تاوانبارانەی سەرانی بەعس کاتێك بەڕیز بەرەو هۆڵی دادگایی کردن دەبرێن



هێنانی صدام بۆ ناو هۆڵی دادگا





هێنانی صدام بۆ ناو هۆڵی دادگا



صدام لەناو هۆڵی دادگادا




گێڕانەوەی صدام لە دادگاوە بۆ زیندان



گێرانەوەی صدام بۆ ناو ئەو ئوتومیبلە سەربازیەی پێی هێنرایە دادگا




**جوانترین وەفا بۆ صدام لەدوای خۆی**

**بریا هەموو ماڵێك ئەم وێنەیەی هەڵدەواسی تا وەلاّم بێت**
**بەتەواوی زوڵم و ژیانی صدام**

# وێنەی بەرگی چەند کتێبێك کەلەسەر صدام نوسراون











# کورتەیەك دەربارەی ( نوسەر )

ساڵی ١٩٧٨ لە گوندی (دەلوجە- قەرەداغ) لە دایك بووە ، لە ساڵی (١٩٨٠) وە لەسلێمانی نیشتەجیٚ یە ، ئێستا (٢٠٠٥) خوێندکاری قۆناغی کۆتایی زانکۆیە ، ساڵی (١٩٩٥) لە بواری هونەریدا (تیپی شانۆی هامڵیت) ی دامەزراندووە و خاوەنی چەندین ئیخراجی شانۆییەو تاکوساڵی (١٩٩٦) بەڕێوەبەری تیپی شانۆی هاملێت بووە ، کارەشانۆییەکانی لە بواری دەرهێنان دا بریتی بوون لە شانۆگەری (گەل مجهول ،گەیشتن بە ئاوات) لە بواری ڕۆژنامەگەریدا سەرنووسەری ڕۆژنامەی (بێداری) بووە هەروەها سەرنوسەری گۆڤاری (مەئوا) ش بووە چەندین وتارو نوسینی لەڕۆژنامەو گۆڤارەکان دا بڵاو بۆتەوە ، ئەم کتێب ونوسراو و نامیلکانەشی تائێستە بە چاپ گەیشتون و بڵاوکراونەتەوە :

١- فریشتە پە یمان ( هۆنراوە - ١٩٩٥ )

٢- سیستەمی سیاسی ئیسلامی لەقەوارەی دەوڵەت دا -١٩٩٧

٣- جیهانی ئیسلامی وژیانی موسوڵمان

٤- سەردەمێك لە شارستانیەتی ئیسلامی -١٩٩٨

٥- دەرئە نجامەکانی پێشکەوتنی ڕۆژئاوا -١٩٩٨

٦- ئاکاری گفتوگۆ لە قورئان وسوننەت وگەوهەری ڕابردووی ئیسلامی دا -١٩٩٧

٧- کۆمۆنیستەکانی دوای هەرەسی شیوعیەت تۆماری شکستێکی دی بۆ مێژوو دەکەن !

٨- کیٚ کۆمۆنیستەکانی کوردستان ناناسیٚ ؟!-١٩٩٩

٩- کێ تیرۆریستە ؟ ئیسلامیەکان یان کۆمۆنیستەکان.

١٠- دیالۆگی ئیسلام وعەلمانیەت .

١١- دژایە تیکردنی ئیسلامیەکان لەبەرژەوەندی کێ یە؟

١٢- بە هێزی و لاوازییەکانی ڕابوونی ئیسلامی -١٩٩٩

١٣- بنچینەکانی ڕابوونی ئیسلامی -١٩٩٨

١٤- بیر خستنەوەیەك لە نزیك بوونەوەی هاتنی مەهدی و ڕودانی جەنگی جیهانی سێ یەم -١٩٩٨

١٥- کێشەی ئافرەتانی چەپ و ناسیۆنال لە نێوان حەقیقەت و جەهل و دژایەتی دا -١٩٩٨

١٦- کارەساتی شیشان.

١٧- ئوسامە بن لادن لە نێوان شەرعیەتی تاڵیبان و پەلاماری ئەمریکادا.

١٨- نوسەران ورۆشنبیرانی کۆیلەی شەراب لەمەعبەدی مە یخانەدا.

١٩- ژیانی صەدام –بەرگی یەکەم-٢٠٠٣

٢٠- ژیانی صەدام –بەرگی دووەم-٢٠٠٤

چاوەڕوانی بەرگی سێیەمی (ژیانی صدام ) بن بەناوبیشانی:

## (داوای لێبوردن لە صدام ئەکەم )